Page fb/ nawandy.hzr.۱
Email/ nawandi.hzr@gmail.com




ناوەندی هزر بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە
هەولێر - پشت پارێزگا - نزیك مزگەوتی مەحمود عەلاف



ناوی كتێب: وەڵامێك بۆ كتێبی (تاوانی بوخاری)

ناوی نووسەر: عەبدوڵڵا گەرمیانی

بابەت: ئایینی

دیزاین: ناوەندی هزر

چاپی یەكەم: ٢٠١٦

تیراژ: ١٠٠٠دانە

نرخ: ٥٠٠٠





لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانەكان ژمارەی سپاردنی(٨٦٨)

ساڵی (٢٠١٥)ی دراوەتێ.

## بەناوی خوای گەورەی میهرەبان

هەوڵی شێواندنی ئیسلام و پایەکانی، زادەی بیری کەسانی یەک سەردەم نەبووە، بەڵکو هەوڵێکی بەردەوام و بەیەکتر سپاردنێکی هەمیشەیی بووە لە نێو ئەو کەسانەی نەیانتوانیووە پەردە لەسەر ئارەزوویان لابدەن و خۆبدەنە پەنای پەیامێك کە عەقڵی دروست بەڕاستی خستووەتەوە و بەڕاستی دەخاتەوە لە ئێستا و داهاتووشدا.

ئارەزوو و دونیاویستی و پێکدادانی ئارەزوو ویژدان و دواتر پشتگیرکردنی ئارەزوو لەسەر بەرژەوەندی ویژدانی ساغ، پاڵنەری زۆربەی ئەو مرۆڤانە بووە کە لە ڕەوڕەوی مێژوودا پشتیان لە پەیامبەران کردووە و لەپەیامەکە چوونەتە سەنگەرەوە و تەنیا بۆ خۆیان خراپ نەبوونە، بەڵکو بوونەتە خراپەکار و تارمایی خراپەی بیروباوەڕیشیان زیاتر کردووە و لە هەندێ حاڵەتیشدا شەیتانیشیان سەرسام کردووە!

کە کتێبی (تاوانی بوخاری) لە نووسینی(زەکەریا ئۆزئۆن)م بینی، بەناو عەقڵانییەکانی ترم بیرهاتەوە کە دەیانەوێ لەپەنای عەقڵێکی نەخۆشەوە کەلێن بخەنە بنەماکانی ئیسلامەوە، تاوێك خۆیان لە بوخاریی دڵسۆزتر بۆ ئیسلام دەناسێنن و تاوێك لەدەمیان دەردەچێ و نیازی دڵیان دەردەخەن! کە تەنیا بوخارییان مەبەست نییە، بەڵکو ئەو بەردەی کە هەڵیانگرتووە و دەیهاوێژن، نیازیان شکاندنی

پەیامبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم) تا بتوانن پەیامەکە بێ ڕۆح بکەن، پەروەردگاریش دەفەرموویێت:﴿يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾﴾ التوبة: ٣٢، واتە: (ئەوانە بەو بیروباوەڕە پووچەیانەوە)دەیانەوێت نوور و ئاینی خوا بە فووی دەمیان بکوژێننەوە و خامۆشی بکەن(بەڵام خەیاڵیان خاوە)خوا ناهێڵێت ئاواتیان بێتە دی و هیچ شتێکی تری ناوێت جگە لەوە نەبێت ئاین و نووری خۆی سەربخات و نووری خۆی تەواو بکات و دەری بخات، هەرچەندە کافر و بێباوەڕان پێی سەغڵەت و دڵتەنگ بن[1].

دواتـر بەسـایتەکاندا گـەڕام دەرکـەوت نووسـەر هـەڵگری بڕوانامـەی ئەندازیارییە، بەڵام لەم کتێبەدا وەك فـەرموودەناس و شـەرعناس و ئسووڵیش دواوە! دونیایـەکی سـەیرە بـەخوا، ئەگـەر بێـت و منێـك لەبابەت پسپۆڕییەکەی ئەودا قسـە بکـەم یـان پسـپۆڕیی پزیشـکێك، ڕەنگە ددان لەدەممدا نەهێڵن! چـوون ئـەوە زانسـتە و منـیش لـەوە شارەزا نیـیم، پزیشـکیی و ئەنـدازیارییش بـۆ خۆیـان دەیـان بـوار و جۆریـان هەیـە و ئەنـدازیارێکی تەلارسـازیی دەم وەرناداتـە بـواری کارەبـا و کشـتوکاڵیی، ڕەنگـە پسـپۆڕێکی ئـاژەڵدارییش بـایی جوتیارێك لە کشتوکاڵیی نـەزانێ، بـەڵام بـۆ بابـەتی ئیسـلام دەبنـە

---

[1] – ڕاڤـەی ئایەتـەکانم لەتەفسـیری ئاسـان و پوختـەی تەفسـیری قورئـان وەرگرتووە.

شـارەزا و پسـپۆڕ و جـێ بـەزانا هەڵکەوتـەکانی لـەق دەکـەن!،
مەبەستم لـە مـەدا لاساییکردنەوەی مێـژووی پیـاوانی کڵێسا نییـە،
بەڵکو هەریەکە و بەقـەبارەی شـارەزایی خـۆی و لەنەزانیشـدا عـەیب
نییـە مـرۆڤ بپرسـێتەوە، وەك پـەروەردگار دەفـەرموویێت:﴿ فَسْـَٔلُوٓاْ
أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ النحل: ٤٣، واتە: ئەگەر هـەر بـڕوا
ناکەن و نایزانن دە ئێوە لە شارەزایان بپرسـن؟ (کـە ڕەوانـەکراوانی
ئێمە پیاوانێکی ناسراوبوون لە ناو قەومەکانیاندا).
پرسیارکردن و تەماشاکردنی کتێبی زانا سەر ڕاستـەکان چارەسـەری
دەردی گومان و بێباوەڕییە بەو مەرجەی مرۆڤەکە ئامـادەیی هـەبێ
بۆ وەرگرتنـی چارەسـەری بەدگومانییەکـەی و بـەدەردی نەخۆشـان
نەکەوێتــە کەللەڕەقییــەوە لـــە تـــەك دەرمـــان و چارەســـەری
دەستنیشـانکراوی پزیشـکەکەی! منـیش لێـرەدا خـۆم بـە زانـا
نـەزانیووە کـە وەڵام دەدەمـەوە، بـەڵکو ئـەرکێکی زانسـتیی و
ئاییندارییـە کـە لـە بەناهـەق پـەلاماردانی بیروبـاوەڕ و گـەورەی
فەرموودەناساندا خۆت کپ نەکەی، بەپشـت بەسـتن بەسەرچـاوەی
زانایان پشت بەخوا وەڵام دەدەینەوە بەرانبەر بەقسـە و جوینـەوەی
هەندێ تۆمەت و سەرچاوەی ناڕەسەن تـاوەکو لای خوێنـەری کـورد
مەزنترین سەرچاوەی فەرموودە بەناڕەوا نەکەوێتە ژێر پرسیارەوە.
کتێبە عەرەبییەکەی لە سـاڵی (٢٠٠٤) چاپی یەکـەمی بڵاوبووەتـەوە
بەناونیشـــانی (جنايـة البخـاري) واتــــە (تـــاوانی بوخـــاری)
نزیکەی١٧٠لاپەڕەیە، لە ڕاستیدا دەبـوو بینووسـیبایە (التَّجنِّي على

البخاري) واتە (بەناهەق تاوانكردن بەرانبەر بوخاری)، ئەم كتێبەی (زەكەریا ئۆزۆن) نووسیویەتی و (ئارام حاجی) لە عەرەبییەوە كردوویە بە كوردی و (هاوژین مەلا ئەمین) پێداچوونەوەی كردووە و ساڵی (٢٠١٥) بڵاوبووەتەوە و چاپی یەكەمی لەسەر نووسراوە و زنجیرەی (٧)ی ئایین و ئەفسانەناسی پرۆژەی هاوبەشی ماڵی سوهرەوەردی و ناوەندی غەزەلنووسە.

بەهیوام وەڵامێك بێت ببێتە هەڵماڵەری ئەو بەدگومانی و كردە ناحەزكارییەی كە تاوانخوازێكی وەك زەكەریا ئۆزۆن بەبێ ڕەچاوكردنی ئەرك و ئەمانەتی زانستیی و جیاوازییكردن لەنێوان پسپۆڕییەكان ئەركی ئەخلاقییانەی وازلێهێناوە و پەلاماری توانای تەشریعیی و ئەخلاقیی و زانستییانەی ئیسلامی داوە. ئومێدمە بەم كارەم شەفاعەتی پەیامبەری ئازیز موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بەدەستبخەم، وەكو چۆن بەدوژمنایەتیكردنی، مرۆڤ خەسارەتی دونیا و ئاخیرەت دەچنێتەوە.

عەبدوڵڵا فازڵ حەسەن (عبدالله گەرمیانی)

١٣/ ١١/ ٢٠١٥

## ئایین و ئەفسانە و سوهرەوەردیی

**ئایین/** (دین) لە قورئاندا دوو واتای یەکتر تەواوکەری هەیە، واتایەك مەبەست پێی شەریعەت و بەرنامەی ژیانە و پێویستە مرۆڤی باوەڕدار بەپێی ئەو شەریعەتە ژیانی خۆی رێکبخات، واتای دووەمی تەواوکەریش واتا قیامەت و ئاخیرەت، لەئاخیرەتدا بەرەنجامی بیرو گوفتارو کرداری دونیات دەچنێتەوە، وەك لەم دوو بەڵگە قورئانییەدا ڕووندەبێتەوە: ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾﴾ آل عمران: ٨٥، واتە: جا ئەوەی بێجگە لە ئایینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لە قیامەتیشدا لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندانە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾﴾ الفاتحة: ٤، واتە: خاوەن و سەرداری ڕۆژی پاداشت و سزایە(پادشای ڕۆژی قیامەتە کە دادپەروەری ڕەهاو بێ سنووری تێدا بەرپا دەکات).

**ئەفسانە/** (أسطورة و خرافة) ئەو چیرۆك و باسانەیە کە بنەمای ڕاستییان نییە، وەك ئەو فرە خواییەی لە یۆناندا هەبووە، خوای باران و خوای شیعر و خوای میوزیك و دەیان خوای دروستکراوی تری زادەی مرۆڤی لە پەیامی ڕاستەقینە هەڵهاتوو بۆ عەقڵێکی نەخۆش کە ئەوی ڕادەستی نەفامی و تاریکیی کردبوو، یان ئەو

باوەڕەی کە نانی وشك و شەربەتی مێوژی کردووەتە گۆشت و خوێنی عیسای پەیامبەر(علیه السلام)، کە وەهایان داناوە هەر کەسێ لەو بۆنەیەدا نانی وشك و شەربەتی مێوژ بخوات لەلاشەیدا دەبنە گۆشت و خوێنی مەسیح و لە سووتانی دۆزەخ دەیپارێزن.

جا لەبەر ئەوەی ئایین بەرنامە و شەریعەتە، بەرنامە ئاسمانیی و دەستکردەکانی تری مرۆڤ هەر بەئایین دادەنرێ و ئەفسانەش وەك ئاینێك مامەڵەی لە تەکدا کراوە و قوربانیی لە پێناودا دراوە، ئیسلامیش بۆ ڕەواندنەوەی ئەو فسانانە هاتووە کە بەپەیامبەرانەوە لکێندراوە و کرۆکی بانگەوازەکەشی لێکجیاکردنەوەی ڕەوا و ناڕەوایە.

**سوهرەوەردی/** یان سەهرەوەردی، لەسوهرەوەدەوە وەرگیراوە، نەسەبدانە، ناوی شارێکی ئێران بووە و بووەتە نەسەب و نازناو بۆ کەسێك ناوی (شیهابەدین عومەر) و بەسوهرەوەردی ناوبانگیی دەرکردووە، ئیبن کەسیر دەڵێ: لەحەلەبدا گەنجێك بەناوی سوهرەوەردی بووە هاوڕێی (ئەلمەلیك ئەلزاهیری کوڕی سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی)، شارەزای کیمیا و سیحر و جادووی چاو بوو[1]، لەبەر بانگەوازکردنی بۆ ئەو پیشەیەی لەژێر پەردەی ئاییندارییەوە سوڵتان سەلاحەدین فەرمانی کوشتنی داوە.

---

[1] - بروانە: الإمام الحافظ عماد الدين أبي الفداء إسماعيل بن كثير القرشي الدمشقي، ج١٣، ص٥، ط١، ١٤٢٣هـ- ٢٠٠٣م مكتبة الصفا.

سولّتان لەسنووری دەولّەتەکەی خۆیدا خزمەتی زۆری سۆفییەکانی کردووە، خانەقای بۆیان دروستکردووە و بژێویانی لەئەستۆ گرتووە، بۆ خۆیشی بەزۆریی گوێبیستی قورئان و فەرموودە بووەو سەرباری سولّتانێتییەکەی لە بەردەم زانایان دانیشتووە و فەرموودەی ئەزبەردەکردووە. سولّتانێ کە لەبەر نزیکبوونەوەی مندالّبوونی ئافرەتێک دەستی لەرزگارکردنی شارێك هەلّگرتبێ و لەفەتحی قودسدا رێی بەخاچپەرستان نەگرتبێ تا بەئازادییەوە دەربچن و سەربووردەی جوانی ئەو کە بووەتە نمونەی رەوشتبەرزیی موسلّمانان لای خەلّکە دوژمنەکەشی[1]، ئاخۆ هۆکار چی بێ دەستی بچێتە کوشتنی سوهرەوەردی؟

زەهەبی لەکتێبەکەیدا(تاریخ الإسلام و وفیات المشاهیر والأعلام) بەلێکۆلّینەوەی دکتۆر (بشار عواد المعروف) دەگێرێتەوە: هەندێ شەرعناسی عەجەم باسیان کردووە کە لای (قابون) لە تەك شەهابەدینی سوهرەوەردیی بوونە و...(تورکمانی) دەستی سوهرەوەردیی راکێشاوە و قۆلّی لێ بووەتەوە و خوێن فیچقەی

---

[1] - دەکرێ کەسانێك هەبن رەخنەیان لەسەلاحەدین هەبێ، بۆ وەرگرتنی بۆچوونی کەسێکی شارەزا و سەرراست لەو بارەیەوە بروانە کتێبەکەی پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین محەمەد حوسێن: سەلاحەدین بدوێنین یان خۆمان بە بەرپرسیار بزانین، وەرگێرانی: ئاواز فاتح جاف، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، بەدەر لەپێشەکیی ئەنجامدەری چاوپێکەوتنەکە لەو کتێبەدا زۆرێك شت روونەبێتەوە.

کردووه... (تورکمانی) پەشۆکاوە و قۆڵەکەی فڕێداوە و ڕایکردووە، سوهرەوەردیش بەدەستەکەی تری قۆڵەکەی هەڵگرتووەتەوە و کە لەتەکماندا بەڕێکەوت و تەنیا دەستە سڕەکەیمان پێ بینیووە و هیچی تر و زۆر شتی سەیری بەخەڵك پیشان داوە... (سیف الآمدي) وتویەتی: لە حەلەب لەگەڵ سوهرەوەردیی کۆبوومەوە، زانستی زۆر بوو، وەلێ کەم عەقڵ بوو، سوهرەوەردیی وتی: دەبێ ببمە خاوەنی ئەم زەمینە، لەخەودا بینیومە ئاوی دەریام خواردووەتەوە.

(إحسان إلهي ظهير الباكستاني) لە کتێبەکەیدا (التصوف... المنشأ والمصادر) باسی ئەو جۆرە لە تەصەوفییە دەکات و دەڵێ کە دانراوەکانی حەلاج و ئیبن عەرەبی و سوهرەوەردی و کەسانی تریش کاریگەربوونە بەفلاتونییەتی نوێ و دانراوەکانی ئەرستۆتالیس، بەتایبەت لەبابەتەکانی(فیض و خۆشویستن و مەعریفە و ئیشراق) و سوهرەوەردیش سەرۆکی ئیشراقییەکان بووە و لەڕێگەی ئەو و کەسانی ترەوە مەترسیترین بیروباوەڕی وحدة الوجود و حلولییەت تێکەڵ بەبیری تەصوفی ئیسلامیی بووە.

لەسەردەمێکدا کە سوڵتان و باپیری کوردان لەجەنگی داگیرکاریی خاچپەرستەکان بووبێ و شەڕی ڕافیزەی لەسەر خۆی و دەوڵەتەکەی لابردبێ، چۆن هەڵوێستێکی دەبێ لەسەرهەڵدانی مەترسیترین بیروباوەڕێك و سەرسامکردنی خەڵك بەپیشاندانی دیمەنی لەخشتەبەرەوە بەناوی پاکبوونەوە لە لاشە و ئاشنابوون

بەجیهانی بالآ و ترساندنیان و خۆنزیکردنەوە لە کوڕەکەی؟ ئەکرێ دوای ئەو هەموو هەوڵ و تێکۆشانەی کە بۆ پارێزگاریکردنی خاکی موسڵمانان دای لە بەرانبەر خاچپەرستاندا کە هەموو بەیەك ڕەنگ و باوەڕەوە دەریاکانیان بڕی دۆخەکە بەسوهرەوەدی بسپێرێ تا حەلاج و ئیبن عەرەبیی ئاسا بڵێ خوا لەناو مندایە!

سەیر لەوەدایە خەڵکانێك کە پابەندییان بەئاینەوە نییە مرۆڤدۆستانە لەم کارە هاتوونەتە دەنگ! کەچی لەبەرانبەر ئەشکەنجە و بەناهەق کوژرانی زانایانی تری ئیسلام زۆر بێدەنگن! بۆ حەلاج و سوهرەوەردی بەداخن، بەڵام دژن بە شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە کە لەبەندیخانەدا مردووە ئەگەر نەشکوژرابێ، بۆ سەیدقوتبی ڕەحمەتی هیچ ناڵێن کە لەسەر بیروباوەڕ لەسێدارە درا....سەیر لەوەدایە مادام شێخی ئیسلام و سەید قوتب خزمەتی ئیسلامیان کردووەو لای زۆربەی موسڵمانان قورسایی خۆیانیان هەیە، ئەوە بەسەرچاوەی تیرۆر و مەترسیی ئاسایشی جیهانیان دەزانن، ئیلحاد و حلولییەتیش بە سەرچاوەی ڕۆشنگەریی!

## ڕزگارکردنی ئایین له دهست پێشهوای فهرموودهزانان!

ئهم ناونیشانه جێی پێکهنین و لهههمان کاتیش جێی ئهوهیه بۆ نووسهرهکهی بگری! تۆ بڵێی کاکی نووسهر لهخهمی ئایینهکهدا بێ و بهچاوی پڕ فرمێسکهوه ئهمهی بۆ خزمهت ئیسلام و پاداشتی خوایی نووسیبێ!؟ ئهوهی کهمێك فامی بێ دهزانێ وهها نییه، چونکه ههر زوو پهلامار دهدات و ڕهتی دهکاتهوه فهرمووده حوججه بێ و ئیسلام شتێکی پێ بێ بۆ ئهم سهردهمه بگونجێ، له وێنهی پهپولهدا ژههری دووپشکمان بۆ دهخاته جهستهوه، لهپێستی مهڕدا پهلامار دهدات، ئهگهرنا له کاری لێکۆڵینهوهی فهرموودهناسان دهگهیشت و بهڕێزهوه دهدوا.

ڕهنگه لێی تێکچووبێ و ئیسلام و مهسیحییهتی وهك یهك هاتبێته پێش چاو، له وێنهی پیاوانی ئایینی مهسیحییهتدا فهرموودهزانانی ئیسلامی بینیبێ، که موسڵمانان بۆیان نهبووبێ فێری زانست و زانیاریی ببن و خوێندنهوهی قورئان و ڕاڤهکهی تهنیا لهوان وهربگرن، بێ ئاگا لهوهی فهرموودهزانان بوون له ڕێگهی گێڕانهوهی فهرمووده سهحیحهکانهوه شۆڕشێکی زانستییان بهرپاکرد و فێربوونی زانستییان کرده ئهرك بهسهر موسڵمانانهوه که دهبێ ههریهکه و بهش بهحاڵی خۆی لهئایینهکهی شارهزابێ و بهبهڵگهی قورئان و فهرمووده شارستانییهتێکیان بوونیاتنا که ههندێ مێژوونووسی ڕاستگۆ مهدهنییهتی ئهورووپا بهقهرزداری ئهو

شارستانییەتە نەزانن، زانا گەورەکانی ئێمەی کوردیش لە ڕێگەی ئەو زانستانەوە بەرهەمی نایاب و نووسین و فێربوونیان بۆ تۆمارکردووین.

**نووسەر ئەم کتێبەی پێشکەش کردووە** (بەوانەی ڕێز لەعەقڵ دەگرن و بۆ بڕیاری عەقڵ دەگەڕێنەوە و لەتاریکیی چاولێکەریی باوکسالاریدا چرای بیرو ڕۆشنبیری دادەگیرسێنن)، بەڵام ئەگەر لەزانستی فەرموودە ڕابمابایە و شۆڕشی یەکتاپەرستیی ئیسلامی بەدروستی ببینایە دژ بەستەمکار و چەوسێنەرانی ژن و پیاو و هەژار و بێ دەسەڵاتان، ڕەخنەی دژ بەپیاوە ئایینییەکانی مەسیحییەتی سەدەکانی ناوەڕاستی بە بەر فەرموودەناساندا نەدەکرد.
لەپێشەکی وەرگێڕدا هاتووە کە ئەم کتێبە دەیەوێت ئەو ئیسلامەمان پێ بناسێنێت کە فەرموودە پەرستەکان پەیڕەوی دەکەن، بەو شێوەیەی کە لە(صحیحی بوخاری)دا هاتووە، لاپەڕە(٧).

**لەلاپەڕەکەی دواتردا دەڵێ** وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ ئاشناکردنی خوێنەری کوردە بەم سەرچاوە سەرەکییەی هزری ئیسلامی و ڕەوتی سەلەفی لە دنیای ئیسلامدا. بەشێکی وەڵامدانەوەی ئەو قسانە دواتر لە وەڵامدانەوەی نووسەردا دەبیینن پشت بەخوا، فەرموودەپەرستان زاراوەیەکی زۆر نەزانانەیە و دونیای ئیسلامیش بە سەلەفی و پەیڕەوکارانی تری مەزهەبەکانی ئەهلی سوننە

بەچاوی گرنگ و پڕ بایەخەوە دەڕواننە سەحیحی بوخاری و زانستیانە لێکۆڵینەوەیان کردووە و کۆدەنگیی تەواوی موسڵمانانی لەسەرەو خوای گەورەش موسڵمانان لەسەر گومڕایی کۆ ناکاتەوە.

ئینجا وەرگێڕ دەڵێ: (چیدی ئایین لەگێڕانەوەکانەوە وەرنەگرین و هەستی ئایینی ڕاستەقینەی خۆمان بکەینە مەحەك بۆ پەسەندکردنی ئەوەی کە بەناوی ئایین و فەرموودەوە لەڕابردووەوە پێمان گەیشتووە) لا ٨٧. وەرگێڕ تەواو ڕوونی نەکردۆتەوە پێوەری ئەو چییە بۆ هەڵسەنگاندنی فەرموودەکان! ئەوەی نەچووە خانەی عەقڵ و بەرژەوەندییەوە تووڕ بدرێ و لەکۆی ئەو هەزاران فەرموودەیەدا چەند دانەیەکی هەڵبژێرین و بەهەستی ئایینیی خۆمان شێوازێکی نوێی ئایینداریی هەڵبژێرین؟ ئەو هەستە ئایینییەی کە بەشێکی مرۆڤەکانی کردووەتە مشك پەرست و مانگا پەرست و بوزی و سیخ و سەدان شتی تر؟ ئاخۆ بەبێ بەڵگەی قورئان و فەرموودە و لێکۆڵینەوە لە حیکمەتی ئیسلام و هەوڵی زانایان لە نەهێشتنی ئەو شتانەی بەئیسلامەوە لکێندراون و ئەهلی ئەو کارەن چۆن دەتوانین هەستە ئایینییەکەمان ئیسلامیانە بکەین؟!

ئەوە عەقڵە زانستی فەرموودەی هێناوەتە ئاراوە و عەقڵی ساغە بڕیاری داوە لە بابەت زانستی فەرموودەدا چەندان کتێب بنووسرێتەوە و چەندان کتێب تایبەت بکرێ لە بابەت گێڕەرەوانی فەرموودە و حاڵ و دۆخیان.

که له کۆتایی پێشەکییەکەدا بینیم نووسراوە هەر خودا پشت و پەنایە بیرم بە لای دوو شتدا ڕۆیشت، یان هەر بەحەقیقەت نووسەرەکەی بەدڵسۆز زانیوە و وتویەتی با ئەم کارە چاکەیە بگەیەنم، کە من ئەو گومانەم نییە، یان دەیەوێ لەپاڵ ئەم دەستەواژەیەدا تیری نووسەر بگەیەنێتە دڵ و مێشکی خەڵکانێ!!!

## فەرموودە چییە؟

لەزاراوەی شەرعییدا وەها پێناسە کراوە: هەر قسە و کردار و تەقریر[1] و سیفەتێکە درابێتە پاڵ پەیامبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) .

## زانستی فەرموودە چییە؟

زانستێکە بەهۆیەوە حاڵی گێڕەرەوە و گێڕدراو دەناسرێتەوە لە ڕووی قبوڵکردن و ڕەتکردنەوەوە نەك لە ڕووی حوکمەوە، فەرموودەناسان هەقیان بەسەر ئەحکام و هەڵهێنجاندنی فەرموودەوە نییە، بەڵکو کاریان لەسەر کەسی گێڕەرەوەو فەرموودە گێڕدراوەکەوەیە ئاخۆ قبوڵکراون یاخود نە[2].

---

[1] - تەقریر: بەهەر کار و کردەوەیەك دەوترێ هاوەڵان وتبێتیان و ئەنجامیان دابێ و پەیامبەری ئازیزیش ئاگاداری بووبێ و هیچی نەفەرموبێ، بێدەنگ بوونەکەی نیشانەی ڕازی بوونی بووە، دەنا ئەگەر قسە و کردارەکە هەڵەبووبێ ئاگاداری دەکردنەوە.

[2] – بڕوانە: شرح نزهة النظر في توضيح نخبة الفكر للحافظ ابن حجر العسقلاني، شرح لفضيلة الشيخ محمد بن صالح العثيمين، ص١٧، ط١، ١٤٣٥هـ- ٢٠١٤م دار الغد الجديد.

هەروەها بەشێك لەزانستەكانی فەرموودە، ڕوانینە سەنەدەكان و زانستە بەكام لە فەرموودەكان كاركردن پێویستە و سەنەدەكەی تەواوی مەرجەكانی قبوڵكردنی تێدایە یان نە، چونكە بەدڵنیابوون لەڕاست و دروستی فەرموودە كار دەكرێ و زانیارییە بەگێڕەرەوانی فەرموودە لەڕووی عەدل[1] و ئەزبەردەكردنەوە، بەگواستنەوەی لەزانا هەڵكەوتەكانی ئیسلامەوە دەبێ، چونكە سەر ڕاست و دوورن لەوەی تانەیان لێ بدرێ و تووشی بێ ئاگایی هاتبن...[2].

[1] – عەدل: واتا ئەو كەسەی فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە تاوانە گەورەكانی ئەنجام نەدابێ و لەسەر تاوانی بچووكیش بەردەوام نەبووبێ.

[2] - بڕوانە: تاريخ ابن خلدون، ج١، الفصل السادس في علوم الحديث.

## ڕێگرییکردن و نووسینەوەی فەرموودە

شتێك هەیە زۆر جار تانەدەران لە سەرچاوەکانی فەرموودە دەیکەنە چەکی دەستیان و بۆ هێنانەدی ئامانجەکانیان بەکاریدەهێنن، تەنیا دیوێکی بابەتەکە دەگرن و وەك بابەتێکی یەکلاکەرەوە وەریدەگرن بۆ پەلاماردانی سەرچاوەی دووەم و تەواوکەری یەکەمی تەشریعی ئیسلامی.

فەرموودەیەکی ئەبو هورەیرە دەهێننەوە(خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەرچوو ئێمەش خەریکی نووسینەوەی فەرموودە بووین، فەرمووی: ئەوە چی دەکەن؟ وتمان: ئەو فەرموودانە دەنووسینەوە کە لە تۆوە بیستوومانە، ئەویش فەرمووی: کتێبێك جگە لە کتێبی خوا دەنووسنەوە؟ ئاخۆ دەزانن ئوممەتەکانی پێش ئێوە بۆیە تیاچوون چونکە لەگەڵ کتێبی خوادا شتی تریان دەنووسیەوە.

بەلآم نازانن، یان بەئەنقەست خۆ گێل دەکەن لەوەی لەفەرموودەیەکی تر کە ئەبو هورەیرە گێڕاویەتییەوە دەڵێ: هیچ هاوەڵێکی تری پەیامبەر نەبووە فەرموودەی لەمن زۆرتر بێ جگە لە عبدالله بن عمر و بن العاص، چونکە ئەو دەینووسیەوە و من نەمدەنووسیەوە. زەکەریا ئۆزۆنیش ئەم قسەیەی ئەبو هورەیرەی باسکردووە، بێ ئاگا لەوەی وەلآمە بۆ خۆی، چونکە سەرەتا

پەیامبەری خوا نەهی کرد فەرمووده بنووسرێتەوه نەوەك تێکەڵ بەقورئانی بکەن و هەندێ زاناش هەیە دەڵێن ڕێگرییکردنەکە نەسخ بووەتەوه، قسەی دواتری ئەبو هورەیرەش(خوای لێ ڕازی بێ) پشتگری ئەوەیە.

دواتر پەیامبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (تَحَدَّثُوا عَنِّي وَلَا حَرَجَ ، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ)، واتە: لەمنەوه فەرمووده بگێڕنەوه و تاوانبار نابن، بەڵام هەرکەسێك بەئەنقەست درۆی بەدەم منەوه کرد با شوێنێك لە دۆزەخ بۆ خۆی دیاری بکات.

یا ئەوەی کە (عبد الله بن عمرو بن العاص) دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: (كنت أكتب كل شيء أسمعه من رسول الله صلى الله عليه وسلم أريد حفظه فنهتني قريش، و قالوا تكتب كل شيء سمعته من رسول الله صلى الله عليه وسلم و رسول الله صلى الله عليه وسلم بشر يتكلم في الغضب و الرضا؟ فامسكت عن الكتاب. فذكرت ذلك لرسول الله صلى الله عليه وسلم فأومأ بإصبعه إلى فيه و قال: أكتب فوالذي نفسي بيده ما خرج منه إلا حق)[1]، واتە: هەرشتێکم لەپەیامبەری خواوه (صلى الله عليه وسلم) گوێ لێبوایە دەمنووسیەوه، قورەیش نەهیان کرد و وتیان: تۆ هەموو قسەیەکی پەیامبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەنووسیتەوه، لەکاتێکدا

---

[1] - سنن الدارمي ١/ ١٢٥.

پەیامبەر مرۆڤە و لە تووڕەیی و ئاساییدا قسە دەکات؟ منیش لەنووسینەوەی فەرموودە دەستم هەڵگرت و ئەوەم بۆ پەیامبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باسکرد، ئەویش بەپەنجەی ئاماژەی بۆ زمانی خۆی کرد و فەرمووی: بنووسە سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هیچ شتێك لەم زمانەوە دەرناچێ حەق و ڕاستیی نەبێ.
حەقیقەتی سەرەتای نەهیکردنی پەیامبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە نووسینەوەی فەرموودە بۆ ئەوە بووە قورئان و فەرموودە لەیەك موسحەفدا کۆ نەکرێتەوە لای خەڵك تێکەڵ بێ، بەڵکو ڕێگە دراوە کەسانێك بینووسنەوە کە لەبەریان کردبێ[1].
دواتر کە ترس لەپەیدابوونی کەسانێك هاتەئاراوە لەوەی بەدرۆوە فەرموودە بەدەم پەیامبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) هەڵببەستن کتێبی تایبەت بەزانستەکانی فەرموودە نووسرایەوە، ئەمە و سەرباری ئەوەی پێشتر وەك بەشێك لە زانستەکانی تری ئیسلام دەخوێندرا، لە لق و بەشێکەوە بووە زانستێکی سەربەخۆ و بۆ ماوەیەکی زۆریش ژیاننامەی پەیامبەری خوا و هاوەڵانیش بەشێك بوو لەم زانستە، چونکە یاساکانی بەهێز و تۆکمەن و لە ڕێی ناسینی کەسی گێڕەرەوە قسەکان وەردەگێڕدراو لە بێژەنگ دەدرا.
زانا لە دوای زانا بەشەکانی ئەم زانستەیان فراوان کردەوە و سەدان

---

[1] - بۆ زانیاری و سوودی زیاتر، دەتوانی بڕوانیتە کتێبی: دراسة في مصطلح علم الحديث ی إبراهيم النعمة و هەر کتێبی تری بواری زانستەکانی فەرموودە و مێژووی نووسینەوەی فەرموودە.

کتــێبی دەوڵەمەنــد و نایــاب لــەو بارەیــەوە نووســراوەتەوە کــە دەوڵەمەنترین سەرچاوەیەکن بۆ لێکۆڵینەوە کردن لـە فـەرموودەکان و جیاکردنەوەیان لە ڕووی پلەبەندی و ڕاسـت و دروسـتی و لاوازی و بەهێزییانەوە، ئینجا لەسەر کاری ئەم فەرموودەناسانە شەرعناسان و ئسـوڵییەکان هـاتوون کـاری هــەڵهێنجانی فیقهــی و ئــەحکامیان کــردووە، ئەمــە ســەرباری ئــەوەی بەشــێك لەفەرموودەناســان شەرعناسیش بوون.

# پێشەوا بوخاری

ناوی موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موغیرەی ئەلجەعفی ئەلبوخارییە حافظی ئیسلام و پێشەوای زانا هەڵکەوتەکانێتی، لە ساڵی(١٩٤) کۆچیی لە دایک بووە[١]... بۆ وەرگرتنی زانست چووەتە لای تەواوی فەرموودەناسانی شار و وڵاتان و لەخۆراسان و هەرێمی چیاکان و عێراق و حیجاز و شام و میسر فەرموودەی نووسیووەتەوە... بوخاریی دەڵێ: ئەم فەرموودانەم لەنێو زیاتر لە شەست هەزار فەرموودە دەرهێناوە، هەر فەرموودەیەکم نووسیبێتەوە پێشتر دوو ڕکات نوێژم کردووە.[٢]

ئەحمەدی کوڕی سیاری ئەلمروزی دەڵێ: موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل بەدوای زانست و فەرموودەدا ڕۆیشت و تیایدا هەڵکەوت و شارەزاو بەرچاو ڕوونبوو، جوان شارەزا و ئەزبەردە چاك بوو، تێدەگەیشت و شەرعناس بوو[٣].

حاشدی کوڕی ئیسماعیل دەڵێ: لەبەسرە بووم موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل بۆ بەسرە هات و موحەممەدی کوڕی بەشار وتی: ئەمڕۆ

---

[١] - ابن حجر لە(تهذيب التهذيب)دا ئەڵێ: بنەچە فارسەو لەبوخارا لەدایك بووە، بۆیە بۆی بووەتە نەسەب.

[٢] - بڕوانە:نيل الأوطار ى الإمام محمد بن علي بن محمد الشوكاني، ج١، ص٢٢، دار الحديث القاهرة ١٤٢٦هـ- ٢٠٠٥م.

[٣] – بڕوانە: (تهذيب التهذيب)ی ابن حجر.

گەورەی شەرعناسان هاتووە، ئەبو قورەیش موحەممەدی کوڕی جومعە دەڵێ: گوێم لێ بوو موحەممەدی کوڕی بەشار وتی: (حفاظ)ی دونیا چوار کەسە، بوخاریی بەیەکێك لەو چوار کەسە دانا[1].

بوخاریی دەڵێ: لە هەزار و هەشتا فەرموودەناسەوە فەرموودەم نووسیوەتەوە....فەرموودەناس کامڵ نابێ تا لە کەسانی زانای سەرووی خۆی و ئاستی خۆی و خوارووی خۆی نەنووسێتەوە[2].

ابن عدي الحافظ دەڵێ: لە هەندێ لە زانایانی بەغدا گوێم لێ بوو دەیانوت: موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل هاتە بەغدا و فەرموودەناسان بەم هاتنەیان زانی کۆبوونەوە و ویستیان ئاستی ئەزبەردەکردنی تاقیبکەنەوە، سەد فەرموودەیان هێنا و مەتن و سەنەدی هەموویان شێواند، دە فەرموودە و بەکەسێکیان دا تاقیبکاتەوە، کەسە غەریبەکانی خەڵکی خۆراسان و بەغداش کۆبوونەوە، هەر دە پیاوەکە کە سەد فەرموودەکەیان پێدرابوو ئامادەبوون، یەك بەدوای یەك فەرموودەکانیان لە بوخاری پرسی وتی: نایزانم، زاناکان تەماشای یەکتریان کرد و ئەوانەی بوخارییان نەدەناسی بەلاواز و بێ توانا و ئەزبەردە لاوازیان دەزانی. کە

---

[1] – بڕوانە هەمان سەرچاوە.

[2] - بڕوانە: حياة البخاري: الشيخ محمد جمال الدين القاسمي الدمشقي، تحقيق: محمود الأرناؤوط، ص١٦، ط١، دار النفائس١٤١٢هـ- ١٩٩٢م، جوانترین کتێبێکی پوخت و نایابە لەو بارەیەوە.

لێبوونەوە بوخاری بەکەسی یەکەمی وت ئەو فەرموودانەی تۆ گێڕاتەوە سەنەد و مەتنەکانی بەو شێوەیەیە، کە وەڵامی ڕاست و تەواوی هەموویانی دایەوە، گەورەیی و ڕێزی بوخاریی بۆ ئامادەبووان دەرکەوت و دانیان پێدانا کە زانای فەرموودەناسانە[1].

یەکەمین کەسێك بووە تەنیا فەرموودە سەحیحەکانی کۆکردووەتەوە، پێشەوا ئەبو عەمری کوڕی سەلاحی شەهرەزووری لە(علوم الحديث) دەڵێ: لە موحەممەدی کوڕی یوسفی شافیعییەوە وتویەتی: یەکەمین کەسێك(الصحيح)ی نووسیوەتەوە بوخارییە ئەبو عبدالله موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل، دوای ئەویش موسلیمی کوڕی حەجاج و دوای قورئان دروستترین کتێبە[2].

لەخەودا بینیووی باوەشێنی پەیامبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەکات، ئەمە بۆ لێکدەرەوانی خەو دەگێڕێتەوە، ئەوانیش پێی دەڵێن کە تۆ دەبیتە پارێزەری فەرموودەکانی پەیامبەر و ڕاست و درۆی لێکجیادەکەیتەوە.

بوخاریی لەوە گەورەترە تانەی لێ بدرێ، تانەدان لەو گەورە فەرموودەناسە ئەوەندە نزمی و پووچییە پێویست بەوەڵام ناکات، بەڵام نەوەك خەڵکانێ شارەزاییان پێی نییە دڵیان بکەوێتە بەر تیری

---

[1] – ئەم باسە لەزۆربەی کتێبەکانی فەرموودەناسی و ژیانی فەرموودەناساندا زۆرە، بۆ نمونە لە:(شرح نزهة النظر)و سەرچاوەکەی پێشووش.

[2] – بڕوانە کتێبی(حياة البخاري).

ژەهر پێوەکراوی مەلەوانەکانی ئاوی لێڵ لەنموونەی زەکەریا ئۆزۆن، ئەم باسەمان نووسی.

پێشەوا بوخاریی چەند مەرجێکی هەبوو تاوەکو فەرموودەکە بەسەحیح دابنێ: (شاذ)نەبێ، واتا کەسێکی سەرڕاست شتێکی گێڕایەوە پێچەوانە نەبێ بەگێڕانەوەی چەند کەسێکی سەرڕاست، (علة)ی تێدا نەبێ، سەرڕاست بن(لەتاوانی گەورەو بچووك بەدووربن)، بیریان چاك بێ و شتیان لەبیر نەچێتەوە و شتەکان تێکەڵ نەکەن و متمانەپێکراوبن لە لەبەرکردن و گواستنەوەی فەرموودەدا، ئەمە دەبێ لە هەموو چینێکدا ئەم مەرجانە هەبن بەبێ لە کارکەوتنی یەکێکیان، نابێ پچڕان لەنێوان دوو چیندا هەبێ، ئەبێ کەسێ لەکەسێکی تر فەرموودە دەگێڕێتەوە هاو سەردەمی بێ و چاوی پێکەوتبێ، جا بەم مەرجە توندانەیە پێشەوا بوخاریی بووەتە ئەمیری ئیمانداران لەفەرموودەو پێشەوای فەرموودەناسان.

چەندە جوان وتراوە لەبابەت صەحیحەکەیدا:

صَحِيح البُخَارِيّ لَو أنصفوه
لـما خطّ إِلَّا بِمَاء الذَّهَب
هُوَ الْفرق بَين الْهدى والعمى
هُوَ السد دون العنا والعطب
أَسَانِيد مثل نُجُوم السَّمَاء

أمَام متون كَمثل الشهب
بِهِ قَامَ ميزَان دين النَّبِي
ودان لَهُ الْعَجم بعد الْعَرَب
حجاب من النَّار لَا شكّ فِيهِ
يُمَيّز بَين الرِّضَا وَالْغَضَب
وَخير رفِيق إِلَى الْمُصْطَفى
وَنور مُبين لكشف الريب
فيا عَالما أجمع الْعَالمُونَ
على فضل رتبته فِي الرتب
سبقت الْأَئِمَّة فِيمَا جمعت
وفزت على رغمهم بالقصب
نفيت السقيم من الغافلين
وَمن كَانَ مُتَّهمًا بِالْكَذِبِ
وَأثبت مــن عدلته
وَصحت رِوَايَته فِي الْكتب
وأبرزت فِي حسن ترتيبه
وتبويبه عجبا للـعجب
فأعطاك رَبك مَا تشتهيه
وأجزل حظك فِيمَا يهب
وخصك فِي غرفات الْجنان
بِخَير يَدُوم وَلَا يقتضـب

ئەمە سەحیحی بوخارییە ئەگەر ئینسافی لەگەڵدا بکرایە تەنیا دەبوو بە ئاوی ئاڵتوون بنووسرابایەتەوە، ئەو جیاکەرەوەی ڕۆشنایی و کوێری و بەربەستی نێوان خۆشی و ناخۆشییە، ئیسنادەکانی(پیاوانی گێڕەرەوەی فەرموودەکانی) وەك ئەستێرەکانی ئاسمانن و بۆ مەتنەکانی(دەقەکانی فەرموودەکان) وەك ئەستێرە کلکدارەکانی ئاسمانن کە بەر شەیتان دەکەون، بەسەحیحی ئەو تەرازووی ئایینی پەیامبەر هەڵسوڕاو دوای عەرەب عەجەمیش دانی پێدا نا. بێگومان بەربەستی ئاگر و ڕازی بوون و تووڕەیی لێکجیاکردووەتەوە. باشترین هاوڕێ بۆ پەیامبەر و بۆ دەرخستنی گومانیش دەقێکی ڕوونی.

ئەی ئەو زانایەی زانایان کۆکن لەسەر پایەبەرزییەکەی لە نێو پایەدارانــدا، بەوەی کۆتکردەوە پێشی پێشەوایان کەوتی و بەقەڵەمی قامیشینت بردتەوە، گێڕانەوەی لاوازت ڕەتکردەوە لەگوازەرەوان و ئەوانەی بەدرۆزن تۆمەتبار بوون و سەر ڕاستانیشت جێگیرکرد و لەنێو کتێبەکاندا فەرموودە دروستی، ڕێساکەیت و فەرموودەکانت جوان ڕێکخست کە بوونە جێی سەرسامیی سەرسامبووان، پەروەردگارت ئەوەی پێت بەخشی کە ئارەزووت دەکرد و باشترین شانست هەبوو لەوەی پێتی بەخشی.

هەوڵدانی ڕۆژهەڵاتناسان و خەڵکانێکی تر بۆ تانەدان و کەمکردنەوە لەبوخاریی تەنیا و تەنیا ئامانج پێی شکاندنی ڕێزی پەیامبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) تاوەکو لەسەرچاوەی تەشریع دووری

بخەنـەوە، ئەمـەش بەتێگەیشـتنی خۆیـان نـەوەك ڕوانینـە قسـە و لێكدانەوەی زانا فەرموودەناسەكان كە لەو هزر نەخۆشانە زیـاتر لـە ناوەڕۆكی فەرموودەكان دەگەن.

زەكـەریا ئـۆزۆن هـاتووە بەقسـەی خـۆی دەستەچـنی چـەند فەرموودەیەكی كردووە تا بیسەلمێنێ بوخاریی جێی متمانـە نییـە! بـەلام وەك پێشـەوا شـەوكانیی زەیـدی مەزهـەب لـە(نیـل الأوطـار، لا٢٥)دا دەڵـێ: بزانـە هـەر فەرموودەیـەك لـە صـەحیحەیندا هـاتبێ دروسـتە بەڵگـەی پـێ بهێنرێتـەوە(ئیحتیجاجی پـێ بكـرێ) بـەبێ لێكۆڵینەوە كردن، چونكە پابەندی ڕێگە و شێوازی دروست بوونـە و لای ئوممەتیش قبوڵكراون.

زەكەریا ئۆزۆن لەپێشەكییەكەیدا دەڵێ: ئەم پەرتووكەی بەردەستت كـار لەسـەر بەگەڕخسـتنی عـەقڵ و ڕزگـاركردنی ئێمـە لـەوەهمی گێڕانـەوەكان دەكـات..(لاپـەڕە: ١١). بـەدحاڵی بـوون نووسـەر زۆر ڕوونـە، ئـاخر ئەگـەر بڕوانێتـە كتێبـەكانی زانسـتەكانی فـەرموودە دەبینێ زانایان قسەی خۆیانیان لەسەر كۆی سەحیح و سـوونەنەكان كردووەو وشەی وەها بێ ڕێزیان نەنووسیوە، چونكە ئامانجی ئەوان خزمـەتی زانسـتیی و هـی ئـەمیش هەڵڕێـژانی گومانـەكانی عەقڵـە نەخۆشەكەیەتی.

سەیر لەوەدایە نووسەر لە کۆتایی پێشەکییەکەیدا لێیتێکچووە و ئەم دوو ئایەتەی سورەتی ئەحزابی هێناوەتەوەو بەسەر فەرموودەناساندا دایبڕیووە! یان ئەوانەی فەرموودەیان لا پیرۆزە، نەزان بەخۆی کە ئەم ئایەتە بۆ ئەو بێباوەڕ و دووڕوانانەیە کە شوێن گەورەکانی خۆیان کەوتوون و ملکەچی فەرمانی خوا و پەیامبەر نەبوون (صلی الله علیه وسلم) ، خوای گەورە لەبارەیانەوە فەرموویەتی:﴿ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ﴿٦٨﴾ ﴾ الأحزاب: ٦٧ – ٦٨، واتە: هەروەها(دەڵێن: ئێمە ملکەچ و فەرمانبەرداری ئاغا و گەورەکانمان بووین، هەر ئەوان ڕێگە و ڕێبازی(ڕاستیان) لە ئێمە شێوان و ون کرد خوا ڕیسوایان دەکات. پەروەردگارا: دووبەرامبەر و دوو چەندان سزای ئەوان بدە و نەفرینێکی زۆر بێ ئەندازەیان لێ بکە.

جا با بڕواننە ئایەتەکانی سەرووتر تا جوانتر ڕوونبێتەوە کە خوای گەورە سەرزەنشتی ئەوانە دەکات کە گوێڕایەڵی پەیامبەرەکەی نین، نەك ئەوانەی بەفەرموودەکانی کار دەکەن.

لە ئایەتی (٦٦)ی هەمان سورەت خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿ يَوۡمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيۡتَنَآ أَطَعۡنَا ٱللَّهَ وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ ﴾ الأحزاب: ٦٦، واتە: ڕۆژێك دێت ڕوخساریان ئەم دیو و ئەو دیوی پێدەکرێت لە ناو ئاگردا (تا چاك ببرژێن و بسوتێن) (بەدەم

ئاه و ناڵەوە دەڵێن): ئای خۆزگە فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەرەکەی بووینایە.
ئێستا ڕووندەبێتەوە کە نموونە هێنانەوەکەی بەسەر خۆیدا بڕاوە و پاڵپشتییەکی خوایە بۆ ئەو باوەڕدارانەی قورئان و فەرموودە بەسەرچاوەی سەرەکی تەشریعیی ئیسلامیی دەزانن.
هەروەها پەیامبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: «أَلَا إِنِّي أُوتِيتُ الْقُرْآنَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ»[1]، واتا: من قورئان و هاوشێوەیەکەیم پێ دراوە، واتا:سوننەت (فەرموودە).
نووسەر پرسیارێکی کردووە کە ئایا فەرموودەکانی پێغەمبەر سرووشتی دابەزێنراون؟ (لاپەڕە: ١٥). هەوڵیشی داوە بەبوونی جیاوازیی گێڕەرەوان پێچەوانە بسەلمێنێ، ئەمەش لەخودی خۆیدا لاوازە، ئەگەر هەندێ فەرموودەش بەواتا گوازرابێتەوە کێشەیەك نابێ، چونکە زانایان بەڕێگەی تر و لەفز و بەراوردکارییەوە ڕاست و دروستییەکەیان سەلماندووە، خودی زانستەکانی فەرموودەش باسی لە هەموو جۆرەکانی فەرموودە کردووە و زانایانی فەرموودەزانیش لە کۆن و نوێدا جێ دەستی کارامەیان لەو بوارەدا هەیە، ئەگەر مرۆڤ بەژیری و ویژدانەوە بۆ ڕێساکانی زانستی فەرموودە بڕوانێ دەوڵەمەندێتیی ئەو زانستەی بۆ دەردەکەوێ و فەرموودەکان سرووشن و ڕوونکەرەوەی قورئانن.

---

[1] - بڕوانە: تفسير الطبري ١/ ٦٠، لە تەفسیری ئایەتی٤٤سورەتی النحل.

ئینجا باسی ئەوەی کردووە کە پەیامبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) نەهی کردووە فەرموودە بنووسرێتەوە، ئێمەش ئەوەمان ڕوونکردەوە کە سەرەتا نەهی کردووە نەوەك تێکەڵ بەقورئان بکرێ، دواتر خۆی ڕێگەی داوە کەسانی لەبەرکەر بینووسنەوە، وەك لەو بەڵگەیەی کە عبدالله بن عمر و باسی کردووە و دەڵێ:

(كنت أكتب كل شيء أسمعه من رسول الله صلى الله عليه وسلم أريد حفظه فنهتني قريش. وقالوا تكتب كل شيء سمعته من رسول الله صلى الله عليه وسلم ورسول الله صلى الله عليه وسلم بشر يتكلم في الغضب والرضا؟ فامسكت عن الكتاب. فذكرت ذلك لرسول الله صلى الله عليه وسلم فأومأ بإصبعه إلى فيه وقال: "أكتب فوالذي نفسي بيده ما خرج منه إلا حق")[1] ، واتە: هەر شتێکم لەپەیامبەری خواوە (صلى الله علیه وسلم) گوێ لێ بوایە دەمنووسیەوە، قورەیش نەهیان کرد و وتیان: تۆ هەموو قسەیەکی پەیامبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دەنووسیتەوە، لەکاتێکدا پەیامبەر مرۆڤە و لە تووڕەیی و ئاساییدا قسە دەکات؟ منیش لە نووسینەوەی فەرموودە دەستم هەڵگرت و ئەوەم بۆ پەیامبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) باسکرد، ئەویش بە پەنجەی ئامارەی بۆ زمانی خۆی کرد و فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هیچ شتێك لەم زمانەوە دەرناچێ حەق و ڕاستیی نەبێ.

---

[1] - سنن الدارمي ١/ ١٢٥.

خوای گەورەش خۆی دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ۝١ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ ۝٢ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ۝٤ ﴾ النجم: ١ – ٤، واتە: سوێند بەو ئەستێرەیە کە بەخێرایی ئاوا دەبێت، یان لە شوێنی خۆی دەترازێت و بەردەبێتەوە کاتی نزیکبوونەوەی قیامەت. هاوەڵەکەی ئێوە (موحەممەد) (صلی اللە علیه وسلم) لەڕێی هەق لاینەداوە و باوەڕی پووچیشی نەبووە. وە قسە و گوفتاری پێغەمبەر لە ڕووی هەواو هەوەسەوەنییە، جا کەسێ ئاوابێ چۆن ڕێگە ون ئەکات؟! ئەو قورئانەی کە ئەو دەیڵێت، جگە لەوە کە بەوەحی بۆی دەنێرێ، هیچیتر نییە، واتە: ئەم قورئانە هەر لەلایەن خواوەیە.

یان دەفەرمووێت: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ۝٧ ﴾ الحشر: ٧، واتە: جا ئەوەی پێغەمبەر (صلی اللە علیه وسلم) پێی بەخشیوون وەری بگرن، هەر فەرمانێکی پێدان بەگوێی بکەن، قەدەغەی هەر شتێکی لێکردن مەیکەن، لەخوا بترسن، چونکە بەڕاستی خوا بەتوندی تۆڵە دەسێنێت.

پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ لَّا تَجۡعَلُواْ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيۡنَكُمۡ كَدُعَآءِ بَعۡضِكُم بَعۡضٗاۚ قَدۡ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمۡ لِوَاذٗاۚ فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمۡ فِتۡنَةٌ أَوۡ يُصِيبَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ۝٦٣ ﴾ النور: ٦٣، واتە: (ئەی یاوەران) نەکەن

بانگی پێغەمبەر بکەن، وەك ئەوەی خۆتان لە نێوان یەکتردا بانگی یەك دەکەن چونکە دەبێت قەدری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تایبەتی بێت، بێگومان خوا دەزانێت بەوانەی کە خۆیان پەنهان دەکەن و خۆ دەدزنەوە لەکار و فرمان، دەبا ئەوانەی کە سەرپێچی لە فەرمانی دەکەن بترسن لەوەی کە تووشی تاقی کردنەوەیەکی سەخت، یان سزایەکی بەئێش ببن.

ئینجا فەرموودەکەی هێناوەتەوە کە پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەفەتحی مەککەدا باسی مەککەی کردووە، ئەبو شاه داوای کردووە ئەوەی بۆ بنووسن، پەیامبەریش فەرمانی داوە ئەو بەڵگەنامەیە بۆ ئەو ئەبو شاه بنووسرێ، نووسەر لەم بەڵگەیەدا خۆی بەدرۆ دەخاتەوە، چونکە ئەگەر نەهیکردنەکە تاوەکو دوای فەتح بەردەوام ببووایە بۆ ئەبو شاهیش بەردەوام دەبوو، نەوەك خودی ئازیز داوا بکات ئەوەی بۆ بنووسرێتەوە... هەروەك ئیبن مەسعود سەحیفەیەك دەردەهێنێ و دەڵێ: سوێند بەخوا ئەم فەرموودانە بەدەستی مەسعود نووسراون... پێشتریش ڕوونمان کردەوە نەهییەکە نەسخ بووەتەوە.

پاشان ئەوە دەڵێ: کە ئەبو هورەیرە وتوویەتی عبدالله بن عمرو بەهۆی فەرموودە نووسینەوە فەرموودەی زیاتری گێڕاوەتەوە و دەپرسێ بۆ فەرموودەکانی عبدالله وەك ئەوانەی ئەبو هورەیرە دیار نین؟

ئەمە پرسیارێکە و لەکتێبەکانی زانستەکانی فەرموودەدا وەڵامیان هەیە ئەگەر بۆی بگەڕیبایە، چونکە زۆربەی ئەو فەرموودانەی عبدالله بیستبوونی هاوەڵانی تریش بیستوویانە، ئەگەر لەڕێگەی ئەوەوە بەئێمە نەگەیشتبێ، ئەوە لەڕێگەی هاوەڵێکی ترەوە گەیشتووە.

**لەپرسیاری دووەمی لە لاپەڕە(١٩)** دەپرسێ: ئایا فەرموودەکانی پێغەمبەر سەرچاوەی یاسا دانانە(تشریع)؟

نکۆڵیی دەکات زۆربەیان سەرچاوەی یاسا دانان بن، هەندێ فەرموودەی بواری ئەدەبی خواردنی هێناوەتەوە بەوەی پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) نەبووە یەکەم کەس بەدەستی ڕاست خواردنی خواردبێ.

مرۆڤ دوو دەستی هەیە: ڕاست و چەپ، ئیسلامیش بەقورئان و فەرموودە شێوە ڕاستەکەی بۆ ڕوونکردووینەتەوە، هەر نەبێ سرووشتی پەیامبەران و خۆرسکی مرۆڤە و خوای گەورە لەم ئوممەتەدا زیندووی کردووەتەوەو شتێکی بەجێنەهێشتووە موسڵمانەکان دواتر بۆی بکەونە تەنگانەوە، بەڵێ شانازیی دەکەین بەم ئەدەبە جوانەی کە فێری کردووین با زەکەریا ئۆزۆنیش پێی دڵتەنگ بێ.

**لەلاپەڕەکەی دواتردا لاپەڕە (٢٠)** سووننەتە گوتراوەکانی پێغەمبەر ڕەت دەکاتەوە، نازانم بیانووی چییە! ئاخۆ سووننەتە

کرداربیەکانی هەمان ئەو هاوەڵانە نەیانگێڕاوەتەوە کە سوونەتە وتراوەکانیان بۆ گواستووینەتەوە؟ ئەم قسەیە هیچ نییە دوور شت نەبێ، یان بەڕاستیی نەفامە یان شەیتانە، چونکە یەکلابووەتەوە فەرموودەکانی پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گوتراو و کردار و تەقریرە، ڕووداوەکانی ژیانیش لەم سێ شتە پێکهاتووە: یان بەقسە پەروەردە دەکەی یان بەکردارت پیشانیان دەدەی یان کە قسەو کارێکیان لێ دەبینی و سرووشتیین بێ دەنگ ئەبی و بێدەنگیشت نیشانەی ڕازی بوونە، ئەمە شێوازی پەروەردە کردنە، باوك و دایك و گەورەکان بەمجۆرە نەوەکان پەروەردە دەکەن، پەیامبەری ئازیزیش (صلی الله علیه وسلم) باشترین مامۆستایەکی پەروەردەکاری یەکتاپەرستانە، کە ئۆزۆن ئەو سوونەتەی ڕەتکردووەتەوە بۆ لەکارخستنی زۆربەی فەرموودەکانە.

چی لەحەلاڵ و حەرامکردن و دیاریکردنی سنوورەکانی خوا بەتەشریع دانانرێ؟ تەنیا لای ئەوانە تەشریع نییە، کە ویستی خۆیان و عەقڵی مەستبووی خۆیان لەسەرووی هەموو شتێکەوە دەبینن!

لەبابەت نبوەت و ڕیسالەتدا باسی هەندێ شت دەکات کە خوای گەورە لەسەریان گلەیی لەپەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەکات و نبوەتی بە پێناسەیەکی ناتەواو وەسفکردووە، لە پەراوێزی(٨)دا وەرگێڕ بۆی ڕاستکردووتەوە. ئەوەی نووسەر بەهەڵەی دەزانێ تاوان نییە، بەڵکو خوای گەورە پەیامبەرەکەی فێر

دەکات و حوکمی بۆ ڕووندەکاتەوە و لەڕێگەیەوە ئوممەتەکەشی بەو حوکمە ئاشنا دەکات، لێرەدا جوانیی ئیسلام و مەزنیی هاوەڵانمان بۆ دەردەکەوێ، سەرباری ئەمانەتپارێزیی پەیامبەری ئازیز و لەدڵاشیرین (صلی الله علیه وسلم) کە ئەم ئایەتانە وەك خۆیان پارێزراون و دەسکارییان نەکردووە.

لەلاپەڕە (٢٢)شدا دەڵێ کە پێغەمبەر لەسەرەمەرگدا داوای کردووە شتێکیان بۆ بنووسێ هاوەڵان قایل نابن و وتوویانە کە پەیامی پێغەمبەر قورئانە... وەڵام بۆ ئەمە:

هاوەڵان ئەوەیان ڕوونکردوتەوە کە چوار ڕۆژ پێش کۆچکردنی ئەمەی داواکردووە، ئەگەر فرمان بوایە دواتر فرمانەکەی دووبارە دەکردەوەو ئەوەشی کە وتوویانە پەیامی پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) قورئانە، مەبەستیان ئەوە بووە ئەگەر فرمانێك هەبێ، ئەوە خوای گەورە بۆمانی دەپارێزێ و زانایان دەڵێن: پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ویستوویەتی بۆیان بنووسێ کە دوای کۆچی دوایی خۆی ئەبو بەکر بکرێتە جێنشین و دواتر بەوەی کە کردوویەتییە ئیمام دووپاتکردنەوەی ئەوە بووە، پێشتریش ئافرەتێك دێتەلای بۆ شتێك و دەڵێ ئەگەر ساڵێکی تر هاتمەوەو تۆ نەمابووی لەکێی وەربگرم؟ پەیامبەریش (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێ: لەئەبو بەکری داوابکە.

لەداوای پەڕە بۆ نووسین بەڵگەی ڕوون هەیە بۆ زەکەریا ئۆزۆن کە وەهای دادەنێ فەرموودە نەنووسراوەتەوە.

لەلاپـــەڕە(٢٢)دا پرســـیار دەکـــات ئایـــە فـــەرموودەکانی پێغەمبـــەر پیرۆزن؟ بـۆ ئـەوەی بیسـەلمێنێ پـیرۆز نـیین پـەنای بردووەتـە بـەر بۆچوونی شیعە، ئەمە بەڵگەهێنانەوەی زۆر سەقەتە قسەی کەسانێ بکەیتـە پاسـاو کـە هـیچ ڕێزێـك بـۆ هاوەڵـە نزیـك و گیـان لەسـەر دەستەکانی دانانێن و تانەی نابەجێ بەدایکانی باوەڕداران دەڵێن و نەفرەت دەکەن لـەهاوەڵانێك خـوای گـەورە بـەدەقی ئایـەت فـەزڵ و گـــەورەییانی دەرخســـتووە، کەچـــی ئـــەمان هـــاتوون بـــەژمارەی پەنجەکانی دەست هاوەڵانیان جیاکردووتەوە و نەفرەتبارانی ئەوانی تریان کردووە!

لەپرسیاری چوارەمدا تەحەدا دەکات کە فەرموودە شرۆڤەی قورئانی نەکردووە، بەڵام کـە سـەیری تەفسـیرەکان دەکـەی بەڵگـە دەبینـی کـــەهاوەڵان گێڕاویانەتـــەوە و هـــاوەڵانیش لەخۆیانـــەوە نـــەدواون، حوکمـــەکانی قورئـــانیش هەنـــدێکی ڕوون و ئاشـــکران و ئـــەوانی تـــر هاوشێوە و لێکچوون و کاری زانا و شارەزایانی خۆیـەتی، ئەوەشـی کە دەوترێت پێشـەوا ئەبوبـەکر نـەیزانیوە تەفسـیری: ﴿ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴾ عـبس: ٣١. بکـات دەیکەنـە تانـە، لەکاتێکـدا ئەمـە بـۆ ئەبوبەکری سدیق شانازییە، وەلامێکیشە بـۆ ئەوانـەی بیانوویـان بـۆ بـەگوێ نـەکردنی هـاوەڵان ئەوەیـە: ئـەوان مـرۆڤن و هەڵـە دەکـەن، لەکاتێکدا ئەبوبەکری پێشەوا لەوەڵامدا دەڵێ: کام ئاسمـان سێبەرم

بۆ بکات و کام زەوی لەخۆیم بگریٚ ئەگەر بەبۆچوونی خۆم قسە لەکیتابی خوا (قورئان)بکەم.

لەپرسیاری پێنجدا زەهەری خراپتر دەڕێژیٚ، نەك تەنیا پێشەوا بوخاری، بەڵکو هەوڵدەدات ئەو سەرچاوانەش لێڵ بکات کە بوخاریی فەرموودەی لێیانەوە گواستووەتەوەو هەرسێکیان هاوەڵی بەڕێزن و یەکێکیان خودی عائیشەی دایکی ئیماندارانە(خوایان لیٚ ڕازی بیٚ).

قسەی لەسەر ناوی ئەبو هورەیرە کردووە، ئەمەش شتێکی ئاساییە کە بەهۆی ئەم نازناوەیەوە ناوەکەی وەك پێویست دیار نەماوە، دروستترین بۆچوونێك ئەوەیە کە لەسەردەمی نەفامیدا ناوی عبد العُزی و خاوەن کونییەی أبو الأسود بووە، پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) ناوی گۆڕیووە بۆ عبدالله و کونییەکەشی ئەبو هورەیرە[1].

زەهەبیی لەبارەیەوە دەڵیٚ: هاوەڵێکی حافیظی فەرموودەیە، بوخاریی و موسلیم و ئەبو داود و ترمیزی و نەسائی و ئیبن ماجە لێیەوە گێڕاویانەتەوە، حافیظ و سەلماو و ژیرو موفتیی بووە، خاوەن ڕۆژوو شەو نوێژ بووە.

---

[1] – بڕوانە: (تهذیب التهذیب)ی ئیبن حەجەر.

پاشان زەکەریا ئۆزۆن لە(شرح النهج)دا بەڵگەی هێناوەتەوە کە عائیشەی دایکی باوەڕداران(خوای لێ ڕازی بێ)ئەبو هورەیرەی بەدرۆزنترین مرۆڤ داناوە.

وەڵام بۆ ئەمە: جارێ دەبێ لەوە دڵنیابین کە خودی(نهج البلاغة) پێشەوا عەلی نەینووسیوەتەوەو زانایانی ئەهلی سووننەش وریاییان لەسەر داوە، کاری(شریف الرضي)[1]یان دەوترێ(المرتضي) برای نووسیوێتی، ڕاڤەکارەکەشی کە (ابن أبي الحديد)ە شیعەیەو سەر لەبەری ئەو کتێبە بۆ تانەدان لەهاوەڵان و گەورەییان نووسراوەتەوەو لەگەڵ گەورەیی پێشەوا عەلییدا یەکناگرێتەوە. ئیتر کاکی نووسەر گلەییەکی ماوە! کە هاتووە قسەی دوژمنێکی فڕوفێڵبازی بۆ کردووینەتە بەڵگە.

ئینجا لەلاپەڕە (٢٧)دا ئەوەی وتووە کە پێشەوا عومەر ئەبو هورەیرەی بەدز داناوە کاتێك کردوویەتییە والی بەحرەین و ئاماژەی داوەتە (البداية والنهاية)، لەکاتێکدا لەو سەرچاوەیەدا بەمشێوەیە هاتووە: کە عومەر ئەبو هورەیرەی کردە هەڵسوڕاوی بەحرەین و

---

[1] - ناوی محمد بن الحسين بن موسى العلوي، بەناوبانگ بە (الشريف الرضي)ە، هاتنە دونیاو مردنی لەبەغدا بووە، ، ئیبن حەجەر لەبارەیەوە ئەڵێ: بەڕەفز بەناوبانگەو دانانی نەهجی بەلاغەی بێ ئیسنادی دەدرێتەپاڵ، ساڵی ٤٠٦ك لەبەغدا مردووە. تاريخ بغداد: ٢/ ٢٤٦: لسان الميزان: ٥/ ١٤١.

بەدە هەزار دینار گەڕایەوە. عومەر وتی: ئەی دوژمنی خواو کتێبەکانی ئەم سەروەتەت بۆ خۆت بردووە؟ ئەبو هورەیرە وتی: من دوژمنی خواو کتێبەکەی نییم، بەڵکو دوژمنی ئەو کەسەم دوژمنی خوا و کتێبەکەی بێ. عومەر وتی: ئەم سەروەتەت لەکوێ بوو؟ وتی: ئەسپەکانم سکیان کردو زیاد بوون و دەسکەوت و فرۆشتنی کۆیلەکەم و بەخششەکانمە. ئەوانیش لێیان کۆڵیەوە و بۆیان دەرکەوت قسەکەی ئەبو هورەیرە ڕاستە، عومەر داوایکرد دەسەلاتی پێ بداتەوە ئەبو هورەیرە قبوڵی نەکرد...[١]

ئینجا ئەوەی ئەبو هورەیرە قسەی پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و کەعبی ئەحباری موسڵمان بووی تێکەڵ کردبێ ڕاست نییە، بەڵکو حەقیقەتەکەی ئەوە بووە لەهەندێ خەڵك تێکچووە و قسەکانی پەیامبەر و کەعبی ئەحباریان لێ تێکەڵ بووە نەك ئەبو هورەیرە، هەروەك بیشری کوڕی سەعید وتوویەتی: لەخوا بترسن و فەرموودە بپارێزن و هەموو قسەیەکتان لێ نەبێتە فەرموودە و ئیبن عەساکیریش پشتگیری ئەبو هورەیرە بووە لەڕەتدانەوەی ئەو تۆمەتەدا[٢]، جا باشتر وەهابوو زەکەریا ئۆزۆن تەواوی قسەکانی بگێڕابایەتەوە، بیشیزانیبایە کاری فەرموودەزانان چییە و توانای ئەو زانایانەی بۆ دەرکەوتبایە لەگێڕانەوەی سەنەد و لێکۆڵینەوەیان لەمەتنەکان و ئەوانەش کە قسەی پەیامبەر و کەعبی ئەحباریان لێ

---

[١] - بڕوانرێتە: البداية والنهاية. ج٨ص٩٩مكتبة الصفا.

[٢] - بڕوانە: البداية والنهاية، ج٨.

تێکچوویێ زانا نەبوونە و کاریان بەسەر فەرموودە گێڕانەوە نەبووە، خەڵکانی سادە بوونە و لەکۆڕی زانست و ئامۆژگاریدا ئامادەبوونە، قسەکانی کەعبی ئەحباریش لەبابەت پێغەمبەران و سەربووردەی نەتەوەکانی ترەوە بووە نەوەك تەشریع.

**لە لاپەڕە (٢٩)** باسی دایکی ئیماندارانە عائیشە خوای لێ ڕازی بێ، تۆمەتباری کردووە بەوەی ژیانی پڕ بووە لەململانێ، بەڵگەشی بۆ ئەمە بەدوو دەستەبوونی خێزانەکانی پەیامبەری خوا بووە (صلی الله علیه وسلم) ، زەکەریا ئۆزۆن و هاوبیرەکانی زۆر ناحاڵیین لەو بارەیەوە، سرووشتی ئافرەت و هەوێ باریی نازانن، ئەمە سرووشتە و لەژیانی ئیبراهیم(علیه السلام)یشدا ڕوویداوە کە سارا خاتوون شتێکی بەرانبەر هاجەرە خاتوونی خزمەتکاری بۆ دروست دەبێ، خوای گەورەش داوای تەوبە لەعائیشەو حەفسە دەکات خوایان لێ ڕازی بێ و شتێکی تێدا نییە بۆیان بکرێتە ناتەواویی، ئەوان خێزانی پەیامبەری خوا بوون (صلی الله علیه وسلم) و لەهەموو کەسێکی تر لەپێشترن بۆ تەوبەکردن و خیتابی خوایی تاوەکو لەوانەوە ئافرەتانی موسڵمان فێری شەریعەتەکە بن. لەلاپەڕە(٣٠)بەپشت بەستن بەکتێبی(الأغاني) و(مروج الذهب)باس لەناکۆکیی نێوان عائیشەو عوسمان دەکات(خوا لەهەموویان ڕازی بێ)، لەکاتێکدا ئەو دوو سەرچاوەیە قسەی زۆر لەسەر خۆیان و نووسەرەکانیشیان هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی دادی دڵ و دەروونی

نەخۆشێکی وەها دەدات بێ بیرکردنەوەو ڕوانینە قسەی زانایان و سەربووردەی نووسەرەکان وەك گورگی برسی پڕی بۆ دەبەن و بۆگەنیووی خۆیانی لێ دەدۆزنەوە، لەنمونەی ئەم زەکەریا ئۆزۆنەو تەها حوسێن و کەسانی تر.

خاوەن کتێبی الأغاني–کۆچکردووی٣٥٦ك، ئەمیش یەکێکە لەوانەی بەفیسق و بێ ئابڕوو عەرەقخۆری تۆمەتبارن، ئەبینین گاڵتەجاڕیی دەکات بەپیرۆزییەکانی ئاین وەك ئەوەی یاقوتی حەمەوی لەبارەیەوە دەیڵێ، بەمانگی ڕەمەزان سەغڵەت دەبوو، کە مانگی شەوال بهاتبایە دەگەڕایەوە سەر خواردنەوەی عەرەق و، دەڵێ:

وقد جاء شوال فشالت نعامة الصـ

يام وأبدلنا النعيم من الضر

وضجت حبيس الدن من طول حبسها

ولامت على طول التجنب والهجر

لەبەرئەوە، فەرموودەناسان بەلای خۆی و کتێبەکەیدا نەڕۆیشتوون و ئەوەندە بەسە تەنیا ناوی الأغاني بۆی ببێتە نابووتی، ئەلنەوبەختی لەبارەیەوە دەڵێ کە لە الخطیب و ئەویش لەئیبن طباطباوە کە ئەبی ئەلفەرەجی ئەصفەهانی درۆزنترینی خەڵکیی

بووەو لاپەڕە گەلێکی زۆری دەکرد و پاشان گێڕانەوەکانی هەمووی لەوەدا دەبوو[1].

ئەمەش هەندێ بەڵگەی کتێبی دەوڵەتی ئەمەوی دکتۆر موحەمەد عەلی صەلابی بەڵکو سوودی هەبێ بۆ دۆست و نەیار!:

کتێبی(الأغاني) ئەبو ئەلفەرەجی ئەصفەهانی، کتێبی ئەدەب و شەوچەرەو گۆرانییە، نەوەك کتێبی زانست و مێژوو فیقه، ئاواز و دەنگدانەوەی لەگوێی ئەدیبان و خەڵکانی مێژووزان هەیە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ بێدەنگیی بنووێنرێت بەرانبەر ئەو شعوبیەت و پیلانە و درۆو تانەو عەیبدارکردنانەی تیایدایە. شاعیری عێراقیش مامۆستای بەڕێز(ولید الأعظمي)کتێبێکی بەنرخی نووسیوەتەوەو ناوی لێناوە(السیف الیماني في نحر الأصفهاني صاحب الأغاني)، خوای گەورە پاداشتی بداتەوە قۆڵی مەردانەی لێ هەڵماڵیووە بۆ ئەوەی درۆو ڕاست و ژەهرو هەنگوین و ناوەڕۆکی درۆینەکانی و گڕی شعوبیەت و کینەکانی هەڵماڵێنێ کە وەك ئاگر گڕی لێ بەرزدەبێتەوەو وەك قۆری قوڵدەدات. بەرپەرچی قسە بێ ماناکانی ئەصفەهانی دەداتەوە لەو هەواڵ و گێڕانەوە درۆ و نا متمانەییانەی خراپە دەکات بەرانبەر ئالوبەیتی پیرۆزی پێغەمبەر( صلی الله علیه وسلم)و سەربوردەی پاکیان بریندار دەکات و ڕەوشتی جوانیان

---

[1] - بڕوانە:مێژووی خەلیفە ڕاشیدییەکان گومان وەلامدانەوەکان، ن:دکتۆر محمد عبدالمجید الرفاعي، و:عبدالله گەرمیانی. پێداچوونەوەی:د.کامران سعدالله زەنگەنە.

دەشێوێنێ، هەروەك لەدرۆكانی ئەصفەهانی دەكۆڵێتەوە بەرانبەر موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان و خەلیفە ئەمەوییەكان. مامۆستای بەڕێزو شاعیری ئیسلامیی بەڕێز(ولید الأعظمي) لەو كتێبە بەنرخەیدا ئەو چیرۆكە پچڕو بەربلاوانەی نێو ئەو كتێبە دەكۆڵێتەوە كە تانە دەدەن لەبیروباوەڕی ئیسلامی و ئایینی ئیسلام و جاهلیەت و پووچ و ناڕەواییەكانی تر پێش ئیسلام دەخەن[1].

*ابن الخطیب البغدادي دەڵێ:ئەبو ئەلفەرەجی ئەصفەهانی درۆزنترینی خەڵكیی بووە، زۆرێك قسەو باس و پەڕەی كڕیووەو هەموو گێڕانەوەكانی لەوەوە داڕێژاوە[2].

ئیبن ئەلجەوزی دەڵێ: نمونەی ئەو، متمانە بەگێڕانەوەكانی ناكرێ، لەكتێبەكانیدا ئەوە دەڵێ كە فاسقێتی و خراپەیی لەسەری جێبەجێ دەبێت، عەرەقخۆریی بەئاسان دەزانێ و ڕەنگە ئەوەشی لەبارەی خۆیەوە گێڕابێتەوە. هەركەسێ لە كتێبی(الأغاني) ڕابمێنێ، هەموو ئەو ناشیرینی و خراپەییانە دەبینێ[3].

*الذهبي دەڵێ: زانای گەورەمان تقی الدین ئیبن تەیمیەم بینی ئەصفەهانی لاوازدەخستەوەو لەگێڕانەوەكانی تۆمەتباری دەكردو گێڕانەوەكانی سووك دەكرد[4].

---

[1] - السیف الیماني في نحر الأصفهاني للأعظمي، ص٩بۆ١٤.

[2] - تاريخ بغداد(١١/٣٩٨).

[3] - المنتظم(٧/٤٠، ٤١).

[4] - میزان الإعتدال(٣/١٢٣).

ئینجا زەکەریا ئۆزۆن بەلگەیەکی بێ بنەمای هێناوەتەوە کە عائیشەی دایکی ئیمانداران(خوای لێ ڕازی بێ)بەپێشەوا عوسمانی وتووە(نعثل)، بەلام هەموو ئەم قسانە قسەی سەیفی کوڕی عومەری تەمیمی - کۆچکردووی١٨٠ك خاوەن کتێبی(الفتوح والردة)، زانای گێڕەرەوەی هەواڵ بووەو بەفەرموودە هەڵبەستن تۆمەتبار کراوە، بۆیە هەرکەسێ بوێری بکات لەقسە هەڵبەستن بەدەم پێغەمبەری خواوەصلی الله علیه وسلم لەقسەو هەواڵی خەڵکیش جێی متمانە نابێ، ((ئیبن موعین دەڵێ:فەرموودەو باسەکانی لاوازن، مرەش دەڵێ: فولەیس لەو باشترە، ئیبن عەدی دەڵێ:هەندێ لەفەرموودەکانی مەشهورن، بەگشتیی ڕەتکراوەن(منکرە)و وەرناگیردرێن، ئیبن حبان دەڵێ: لەلایەن سەلماوەکانەوە(الإثبات)ەوە هەڵبەستراوەکان دەگێڕێتەوە، وتوویانە فەرموودەی هەڵدەبەست[1].

جێی ئامارە بۆ کردنە، فەرموودەناسان گێڕانەوەی هەموو کەسێکیان ڕەتکردووەتەوە ئەگەر سەلمابێ بۆ یەکجاریش بەدرۆ فەرموودەی هەڵبەستبێ و هەرگیز فەرموودەیان لێ قبوڵنەکردووە ئەگەر تەوبەشی کردبێ، وەك ئەحمەدی کوڕی مبارەك و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بۆ ئەوە ڕۆیشتوون کە لەوەلامی ئەو کەسەی کەپرسیویتی: زانست لەکێوە بنووسرێتەوە، وتوویەتی لەهەموو

---

[1] - تهذيب التهذيب٤/ ٢٩٥، ٢٩٦.

خەڵكیی تەنیا سێ كەس نەبێ:((خاوەن حەزو ئارەزوویەك كە بۆ حەزەكەی بانگەشە دەكات، درۆزن بەكەم و زۆر هیچی لێ وەرناگیردرێ و بنووسرێتەوە، یان كەسێك باسەكان تێكەڵ بكات، ئەمەش قسەی لێ وەرناگیردرێ[1].

ئەمەش هەر بەوجۆرەیە بەنیسبەت ئەو هەواڵانەی تایبەتن بەژیاننامەی پێغەمبەرصلى الله عليه وسلم و مێژووی هاوەڵان و خەلیفە ڕاشیدییەكان و بیروباوەڕە ئیسلامییەكان و ئەحكامە شەرعییەكان، بۆیە پێشەوایانی الجرح و التعديل و زانایانی مێژوو و لەپێشەوایانی فەرمودە هیچ باس و خواسێكیان لەكەسانێكەوە وەرنەگرتووە درۆزن بن یان بەدرۆ تۆمەتبار بوو بن. لەگەڵ ئەوەشدا مێژوونووسە هەڵكەوتەكان و پێشەوایانی فەرموودە كە هەواڵیان لەلاوازانەوە گواستبێتەوە تەنیا بۆ زانین بووە، لەبەرئەوەی كە هەندێ لەوانەی لەبواری مێژووی ئیسلامیدا گێڕدرابێتەوە بە هەواڵی ئەو كەسانە دادەنرێ هەندێ لاوازن و بەدرۆزن تۆمەتبار نیین، بەڵام هەواڵی درۆزنان ڕەتدەكرێتەوە، چونكە جێی پەندو وانە لێ وەرگرتن نییە، ئەو پێشەوایانە ڕێبازێكی ڕوونیان هەبووە، ئەویش ئەوەیە گێڕانەوە لەكەسی لاواز باش دانان نییە بۆ ئەو كەسەو بە هەواڵەكەی كارناكرێ[2].

---

[1] - الكفاية في علم الرواية، ص١٧٥.

[2] – بۆ نمونە بڕوانە: كلام الذهبي في الرواية عن الواقدي للأعتبار(سير أعلام النبلاء٩/ ٤٦٩).

پێویست بوو زەکەریا ئۆزۆن و کەسانی تری هاوبیریش باش لەوە بگەن کە تەبەریی لەمێژووەکەیدا وەك خۆی دەڵێ، ڕاست و ناڕاستی کۆکردووەتەوەو وەك ئەرکێکی زانستیی تۆماری کردووە، پاکژکردنەوەی خستووەتە ئەستۆی نەوەیەکی تر و کەسەکانیشی بۆ ناساندووین و ئیسنادی گێڕەرەوانی باسکردووە تا شتەکانمان لێ تێکەڵ نەبێ، زۆربەی ئەو شتانەی بەخراپە لەبارەی هاوەڵانەوە هاتووە گێڕانەوەی سەیفی کوڕی عومەرو ئەبو موخنەفە، بۆیە بێ سڵکردنەوەو بەگوێکردنی ڕێساکەی تەبەری، زەکەریا ئۆزۆن پەنای بۆ بردووە[١].

ئینجا بەپشت بەستن بەکتێبی(الإمامة والسياسة)ی بەدرۆ پاڵدراو بۆلای (ابن قتيبة)کە کەسێکی شیعەی هەڵگری هەمان ناو و نازناو نووسیوێتی تۆمەتی کوشتنی عومسمانی خستووەتە ئەستۆی دایکی ئیمانداران، ئەمەش درۆیەکی ئاشکرایە، بەڕوانین بۆ دەرخستنی ڕووی درۆینەی ئەو کتێبە ناڕاستیی ئەو بابەتە ڕوون بووەتەوەو بەگەڕانەوە بۆ کتێبەکەی دەوڵەتی ئەمەوی و باسکردن لەو کتێبانە سوودی زۆر دەکەی.

---

[١] - بۆ ناسینی سەیفی کوڕی عومەرو لاوازانی تر، بڕوانە: تنزيه الشريعة المرفوعة عن الأخبار الشنيعة الموضوعة: نور الدين، علي بن محمد بن عبدالرحمن ابن عراق الكناني، تحقيق: عبدالوهاب عبداللطيف، عبدالله محمد الصديق الغمراوي، ط١دار الكتب العلمية ١٣٩٩هـ

**لەلاپەڕە(٣٢)دا** باس لەوە کراوە کە عائیشەی دایکی ئیمانداران لەبەر پەشیمانیی و نەکردنی کاری باش وتوویەتی لەپاڵ پەیامبەردا مەمنێژن، ڕاستییەکەی بەو جۆرە نییە، بەڵکو عائیشەی دایکی ئیمانداران شوێنی خۆی بەپێشەوا عومەر دابوو، ئینجا وتنی ئەو قسەیە لەوەلامی ئیبن عەبباس بووە کە فەزڵەکانی دایکە عائیشەی باسکردووەو ئەویش ئەوەی وتووە، وەك قسەی تەواوی خواناسان لەبەر پیاهەڵدان و گەورە ڕاگرتنیان، نەك ئەوەی زەکەریا ئۆزۆن وەك مشەخۆر بەدوای بیانووەوەیە بۆ وەرنەگرتنی فەرموودەکانی، لەکاتێکدا بیری چووە عائیشەی دایکی ئیمانداران چەندان فەرموودەی هەیە لەفەزڵی خاتوو خەدیجەو عومەرو عوسمان و عەلی و فاتیمەدا(خوا لەهەموویان ڕازی بێ).[1]

**لەلاپەڕە(٣٢)** باس لە **عبداللەی کوڕی عەباس** دەکات(خوا لەخۆی و باوکی ڕازی بێ)و پێی سەیرە(١٦٦٠)فەرموودەی گێڕاوەتەوە.
ئیبن حەجەر لەبارەیەوە دەڵێ:پێی وتراوە حیبرو دەریا بەهۆی زۆریی زانستییەوەو لەپەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و زۆرێکی تر فەرموودەی گواستووەتەوە[2].

---

[1] - بڕوانە: البداية والنهاية، ج٨.

[2] - بۆ دڵنیایی زیاتر بڕوانە: تهذیب التهذیب ی ئیبن حەجەر تا سەربوردەی ئەم گەوهەرەی ئیسلام و ئامۆزای پەیامبەر(ﷺ)ت بۆ دەرکەوێ و ئەو

لەصەحیحی بوخارییدا هاتووە لەئیبن عەباسەوە وتوویەتی: پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کۆچی دوایی کرد خەتەنە کراوبووم، کوڕان لەباڵغ بووندا خەتەنە دەکران دروست ئەوەیە پانزە ساڵان بووە پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کۆچی دوایی کردووە[1]. ئێمەش دەپرسین ئاخۆ ئامۆزایەکی پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەو تەمەنەدا و بەتێکەڵبوونی بەبنەماڵەو خێزانی پەیامبەری خوا و تامەزرۆ بوونی بەزانست و وەرگرتنی فەرموودە لەهاوەڵان، ئەو ژمارە فەرموودەیە بەزۆر دەزانرێ؟! زەکەریا ئۆزۆن ڕەنگە ماددەگەر بێ، دەنا دەبوو ئاشنا بووایە بەو دوعایانەی پەیامبەری خواصلی الله علیه وسلمبۆ ئەم کوڕە مامەیەی کردوویەتی:((اللهم فقه في الدين، وعلمه التأويل، واتا: خوایە گیان لەئیسلام شارەزای بکەو فێری لێکدانەوەی قورئانی بکە. یان کە فەرموویەتی: ((اللهم بارك فيه وانشر منه، واتا: خوایە گیان بەرەکەتی خۆتی تێ بکەی و نەوەی زۆر بکەی. عەباسییەکان نەوەی ئەون و دوعاکەی پەیامبەری ئازیزصلی الله علیه وسلمهاتەدی. زۆرێك فەرموودەی تر هەیە هەمووی لە (البداية والنهاية) بەشی(٨) لەبەشی مردن و سیفەتی ئیبن عەباسدا کۆکراوەتەوەو دەمکوتی ئەو دەروون نەخۆشانە دەکات کە

---

کەسانەش بناسیتەوە کە ئەم فەرموودەی لێیانەوە گواستووەتەوەو هەموو متمانەدارن.

[1] - بڕوانە: البداية والنهاية، ج٨، ص٢٥٠.

دەیانەوێ لەڕێی تانەدان لەم هاوەڵە بەڕێزەوە بەشێکی گەورەی بیروباوەڕو شەریعەت و ئەخلاقی ئیسلامیمان کەنار بخەن. ئیبن سەعد بەسەنەدی سەحیحەوە دەیگێڕێتەوە کە ئەو ڕۆژەی زەیدی کوڕی سابت مرد، ئەبو هورەیرە وتی: ئومێدمە خوای گەورە بەعبداللەی کوڕی عەباس جێگەی زەید پڕ بکاتەوە[١].

مردنیشی بەمجۆرە بووە: ئاو کەوتووەتە چاوی و پزیشك پێیووتووە: بۆ دەرهێنانی ئاوەکە لەنێو چاوتدا دەبێ حەوت ڕۆژ نوێژ نەکەی، ئەویش وتوویەتی:نە! هەرکەسێ نوێژێ نەکاو توانیبێتی ئەنجامی بدات، ئەوە بەتووڕەییەوە بەخوای گەورە دەگاتەوە. ئەوەشی کە لەبارەی بردنی پارەو سەروەتەوە کە ئیبن ئەسیر گێڕاویەتییەوە بێ سەنەدەو هەڵبەستی سەرچاوەکانی شیعەیە لەڕقی عەباسییەکانەوە وتوویانەتەوەو لە(تاریخ ابن خلدون) بەشی٢ (فراق ابن عباس لعلي رضي الله عنهم)ئەوەندە هاتووە کە ئیبن عەباس ڕۆژێك بەلای ئەبو ئەلئەسوەدی دوئەلیدا تێپەڕ ئەبێ و تەمبێیەکی توندی ئەکات و ئەویش وەها نامەیەك بۆ پێشەوا عەلی دەنووسێ و ئیبن عەباسیش ئاماژەی پێ دەکات کە کێ ئەم قسەیەی کردووەو لەپای چی وتوویەتی. هەر ئەوەندەیەو هیچی تر، دەنا سەربووردەی زانای هەڵکەوتەو حیبری ئوممەت لەوە دوورترە بەوەها کارێك تۆمەتبار بکرێ، قسەکەی پێشەوا عەلیش تاوانبار

[١] - بڕوانە: تهذیب التهذیب.

کردن نەبووە، بەڵکو لێپرسینەوە بووە لەو بارەیەوە، ئەمە بەپێی سەرچاوەکان کە بنەماکانیان ناناسرێتەوە.

**لەپرسیاری شەشەمدا** ئەپرسێ کە ئەو فەرموودانەی پێمان گەیشتوون لەگەڵ نەریت و سیستەم و پێدراوە زانستییەکانی ئەمڕۆماندا دەگونجێن؟ ئەم مرۆڤە زۆر ناحاڵییە، نەیڕوانیووەتە بنەماکانی فیقه و ڕێسا فیقهییەکان و بزانێ ئیسلام چی یاسایەکی دەوڵەمەندی هەیە، نەیڕوانیوە ئیسلام چی شتێکی لەبارەی دەسەلأت و بەڕێوەبردن و ئەرکی دەسەلأتداریی و یاسای تەشریعیی هەیە، نەیڕوانیوەتە کتێبێك و بەدڵێکی ڕۆشن بیری نەکردووەتەوە لەو کتێبانەی غەیرە موسڵمان و تازە موسڵمانبووەکان لەبارەی ئیسلام نووسیویانەو ئەیڵێن و هەر نەبوو تەماشایەکی(الدعوة إلى الإسلام) و (العلم یدعو الإیمان)بکردایە. بیری چووەتەوە ئەوکاتەی کە ئیسلام لەڕێگەی قورئانەوە دروستبوونی گەردوون و شێوەی زەویی ڕوون کردەوە، لای برادەرانی هاوبیروباوەڕی ئەو کە تانەکانی لەسەر ئیسلام وەرگرتووە وەهایان دەزانی زەوی شێوە لاکێشەیی هەیەو لەسەر ئەوەش زاناکانیان سزا دەدا! ئەوکات قورئان ئەمەی تێدا هاتووە: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الأنبیاء: ٣٠

، واتا:ئایا ئەوانەی بێباوەڕ بوون نەیانبینیووەو بۆیان ڕوون نەبووەتەوە بەڕاستی ئاسمانەکان و زەوی یەك پارچە بوون لەوەودوا لێکمان جیاکردەوە(کە ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەم ڕاستەقینە لەلایەن ئەوانەوە پەی پێ دەبرێت)، لەئاویش هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێناوە(ئاو زۆربەی پێکهاتەی لەشی ئادەمیزادو زیندەوەران و ڕووەك پێکدەهێنێت)، ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن(بەو ڕاستیانەو بەو دەسەڵاتە بێ سنوورەی ئێمە)؟!

دەقەکانی هەندێ فەرموودەی بەئەفسانە لەقەڵەم داوە، خۆی بواردووە لەهێنانەوەی بەڵگەی قورئانیی، رەنگە لای ماددیگەرایەکی لەو شێوەیە ئەفسانە بێ، بەڵام لای باوەڕدارێك بەبوونی خوا کە ئەوی لەنەبوو هێنایەبوون و عەقڵێکی پێ دا ڕەنگی نییە شتێکی سادەیەو زیاتر لەوە لەقودەرەت و ویستی خوا چاوەڕێ دەکرێ.

ئیسلام دەستی کەسی نەگرتووە جگە ڕەشکە بەهیچی تر خۆی چارە نەکات! ئەوە موحەممەدصلى الله عليه وسلمبۆمانی ڕوونکردووەتەوە کە خوای گەورە بۆ هەموو نەخۆشییەك چارەسەرێکی داناوەو لەسەرمان پێویستە بەدوای چارەسەردا بگەڕێین.

لەئوسامەی کوڕی شورەیکەوە (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: هاتمە لای پەیامبەرصلى الله عليه وسلمو هاوەڵانی، دانیشتبوون وەك ئەوەی باڵندە بەسەریانەوە نیشتبێتەوە، سەلامم کردو دانیشتم، ئەعرابییەك هات و وتی: ئەی پەیامبەری خوا خۆمان چارەسەر

بکەین؟پەیامبەرصلی الله علیه وسلمفەرمووی:((تداووا، فإن الله عز وجل لم يضع داء، إلا وضع له دواء، غير داء واحد: الهرم[1]، واتا:چارەسەر وەربگرن، خوای گەورە بۆ هەر دەردێك چارەیەکی داناوە جگە یەك نەخۆشیی نەبێ، ئەویش مردن و پیرییە.

ئاخۆ چی لەم فەرموودەیە زانستیی تر ئەبێ کە پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێ: "مَا مَلأَ آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرّاً مِنْ بَطْنٍ، بِحَسْبِ ابْنِ آدَمَ أُكُلاَتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فَإِنْ كَانَ لا مَحَالَةَ فَثُلُثٌ لِطَعَامِهِ، وَثُلُثٌ لِشَرَابِهِ، وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ". واتا:هیچ شتێك نییە پڕ کردنی بەقەد سك خراپ بێ، مرۆڤ ئەوەندە بخوات بێ توانا نەبێ، ئەگەر هەر خواردی با یەك لەسەر سێی بۆ خواردنی بێ و یەك لەسەر سێیەکی تریشی بۆ خواردنەوەو یەك لەسەر سێیەکەی تریشی بۆ هەناسەدان بهێڵێتەوە.

نووسەر تەحەدا دەکات فەرموودە چی چارەسەرێکی پێیە بۆ نەخۆشی کولێرا؟ لەکاتێکدا بەدحاڵیی بووە لەوەی سەرچاوەی تووشبوون بەکولێرا پیسییە، پەیامبەری خواش (صلى الله عليه

[1] – رواه أبو داود (٣٨٥٥) واللفظ له، والترمذي (٢٠٣٨)، وابن ماجه (٢٧٨٩)، وأحمد (٤/ ٢٧٨) (١٨٤٧٧)، وابن حبان (١٣/ ٤٢٦) (٦٠٦١)، والحاكم (١/ ٢٠٩). والحديث سكت عنه أبو داود، وقال الترمذي: حسن صحيح. وقال الحاكم: هذا حديث صحيح ولم يخرجاه، ووافقه الذهبي، وصحح إسناده النووي في ((المجموع)) (٥/ ١٠٧)

وسلم) هاوەڵان فێری پاكیی دەكات و تەهارەتیان پێ فێر دەكات لەوكاتەی لای خەڵكانی تر خۆنەشۆردن و خۆ بەپیسیی و چەپەڵیی هێشتنەوە بەنیشانەی لەخواترسان دانرابوو، هەر لەو كاتەدا خۆپاك ڕاگران دەبنە خۆشەویستی خوا لەئیسلامدا. یان دەفەرموێت: "إِذَا سَمِعْتُمْ بِالطَّاعُونِ بِأَرْضٍ فَلاَ تَدْخُلُوهَا"، واتا: ئەگەر بیستتان لەشوێنێك تاعون هەیە مەچنە ئەو شوێنەوە، لەفەرموودەی تریشدا هەیە دەفەرمووێ لێیشی دەرمەچن، لەمڕۆدا زانست ئەو حیكمەتەی سەلماندووە.[1]

لەلاپەڕە(٣٧)دا نكوڵیی دەكات كە فەرموودەكانی پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) ئوممەتی گەشە پێدابێ، ئەمەش تۆمەتێكی ترە، گەشەی پێ داوە تا ئەو كاتەی موسڵمانان پێوەی پابەند بوونە، گەشەی پێ داوە تا ئەوكاتەی موسڵمانەكان قورئان و فەرموودەیان كردووەتە سەرچاوەی تەشریع و هەوڵەكانیان، تا ئەوكاتەی پشتیان لەیەك نەكردووەو یەكتریان شەرمەزارو ڕادەستی دوژمن نەكردووە، بەپیرۆزییەوە ڕوانیویانەتە قورئان و فەرموودەو قسەی هەواو ئارەزوویان پێش ئەو دوو سەرچاوەیە نەخستووەو لەژێر هیچ

---

[1] - بڕوانە: موسوعة الإعجاز العلمي في القرآن والسنة محمد راتب النابلسي ج١، ص١٠٢.ط٢ ١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٥ م. دار المكتبي - سورية - دمشق - الحلبوني - جادة ابن سينا.

پەردەیەکی ڕووپامابیدا بۆ غەرب زەدەیی نەکەوتوونەتە تانەدان لەئیسلام، چونکە ئەو کات ڕابوونێکی زانستیی ئیسلامیی هەبووەو شارستانییەتەکانی تر بۆ ئەو ڕابوونە تێنووبوونە.

لەلێکۆڵینەوەی لەبارەی ڕۆشنبیریی ئیسلامییەوە، نوسەر ت. کۆلریونج (T. C. Young) ئەڵێ: "ئەو قەرزە ڕۆشنبیرییە گەورەییەی کە ئێمەی مەسیحیی پێی قەرزداری ئیسلامین لەنێو ئەو هەزارەدایە، گەشتمان دەکرد بۆ پایتەختە ئیسلامییەکان و بۆ لای مامۆستا موسڵمانەکان و لای ئەوان وانەی هونەرەکان و زانستەکان و فەلسەفەی ژیانی مرۆیی فێر دەبووین کە پێویستە هەمیشە یادی بکەین و ئەو قەرزدارییە بەبیری خۆمانی بهێنینەوە. ئەوە ئەو کولتوورە کلاسیکییەمانە کە ئیسلام بەجوانترین شێوە چاودێری کرد تاوەکو ئەورووپا توانی جارێکی تر لێی تێبگات و پارێزگاری بکات. پێویستە ئەم قەرزداریەمان تێکەڵ بەو ڕوحە بێ کە ئێمەی مەسیحی ئاراستەی ئیسلامی دەکەین و قەرزی کۆنی بۆ بگەڕێنینەوەو سنووری یەکسانیش نابەزێنین ئەگەر بەقازانجیشەوە قەرزی ڕابردوومان بۆ موسڵمانان بگەڕێنینەوە، بەڵام ئەو کات مەسیحیی ڕاستەقینە دەردەکەوین گەر مەرجی ئاڵوگۆڕمان لەبیرکردو بەخۆشەویستی و داننان بەجوانی بەرامبەر بەخشیمان".......ئاشکرایە لەزۆرێك بوارە زانستی و فیکری و ڕۆشنبیرییەکان، لەوانە داهێنانی ژمارەدانان و سفرو سیستەمی دەیی و تیۆری پەرەسەندنی لای داروین بەسەدان ساڵ پێش داروین

و سووڕی خوێنی گچکە بەچوار سەدە پێش هارفی و هێزی ڕاکێشان و پەیوەندی نێوان کێش و خێرایی و ماوە بەچەندین سەدەی دووردوریژی پێش نیوتن و پێوەری خێرایی تیشك و ئەندازەکردنی گۆشەی تیشکدانەوەو دەوری زەوی و دیاریکردنی لایەنەکانی تەنە ئاسمانییەکان و داهێنانی ئامێرە فەلەکییەکان و دۆزینەوەی بەرزیی دەریاکان و دانانی بنچینەکانی زانستی کیمیا کە هەموو لەداهێنان و کاری موسڵمانان بووە....... هەروەها ویل دیورانت لەم بارەیەوە ئەڵێ: "کاتێك ڕۆجەر بیکۆنReger Baconدوای پێنجسەد ساڵ دوای ئیبنو جوبەیر بەتیۆرەکەیەوە ڕۆیشتە ئەورووپا وتی، کە بەم زانستەی قەرزداری مەغاریبەییەکانە لەئیسپانیا کە زانستەکانیان لەموسڵمانانی ڕۆژهەلأت وەرگرتبوو. کاتێکیش هەڵکەوتەو زانایان لەسەردەمی ڕێنسانسی ئەورووپا دەرکەوتن، ئەوە دەرکەوتن و پێشکەوتنەکانیان کەوتبووە سەر شانی زانا عیملاقەکانی جیهانی ئیسلامی"[1].

ئاخۆ زەکەریا ئۆزۆن بیری لەو فەرموودانە کردووەتەوە کە موسڵمانانی هانداوە بۆ زانست و فێربوونی و دەستگرتن بەڕەوشت و برایەتیی و گیانی هاوکارییەوە...لەلاپەڕەی(٣٨)دا وەك دڵسۆزێك خۆی دەنوێنێ و تانەکەی بەبزەوە دەردەخات کە هەندێ فەرموودە

---

[1] - بۆ ئەم سەرچاوەیە بگەڕێرەوە: ئەشرەف صالح محمد سید: بنچینەکانی مێژووی نوێی ئەورووپا، و:عبداللە گەرمیانی، لەبلاوکراوەکانی دەزگای وەرگێڕان– هەولێر، چ١، ٢٠١٢ڕۆژهەلأت– هەولێر.

لەگەڵ زانست و لۆژیك و هەست ناگونجێ، ئاخر ئەم جارێ خۆی لۆژیکێکی تەندروستی نییە، لە لۆژیکی زانستەکانی فەرموودە نەگەیشتووەو نازانێ کاری فەرموودەناسان چییە یەکسەر سەغڵەت بووەو پەردەی دڵی دەرخستووە! لەبابەت زانستیشدا زۆرێك فەرموودەمان هەیە و خوێنەریش دەتوانێ بەشوێن حیکمەتی زۆربەی ئەو فەرموودانانەدا بچێ کە ئیعجازی زانستییان تێدا هەیەو حەقیقەتن، بڕوانێتە قورئانی سەرچاوەی یەکەمی ئیسلام و فەرموودە کە تەواوکەرو ڕوونکەرەوەی قورئانە، کە ئەگەر فەرموودە نەبێ شێوەی ئەنجامدانی نوێژ نازانین، ئەگەر بەویژدان و لۆژیکەوە وەك خۆی دەڵێ بیڕوانیبایە بەم دەردە نەدەگەیشت. خەڵکانێك هەن بەهەر بیانوویەك بێ فەرموودەکانی پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) وەرناگرن ، بەڵام قسەکانی نووسەر زۆر بێ ڕێزانەیە.

دەشپرسێ ئایە بوخاریی لەسەحیحەکەیدا سەرکەوتووبووە؟ بەڵێ کاکی نووسەر، بۆخاریی لەدیدگاو لێکۆڵینەوەی مرۆڤە هەڵکەوتەکانی بواری فەرموودەناسیی سەرکەوتوو بووەو دوای قورئان یەکەم سەرچاوەی متمانەپێکراوی فەرموودەیە، هەموو سەرچاوەکانی تری فەرموودە جێی ئیعتیبارن و وەرگرتن و ڕەتکردنەوەی هەر فەرموودەیەکیش لەژێر ڕۆشنایی یاساکانی زانستەکانی فەرموودەیە، جیاکردنەوەی هاوەڵ و تابیعیش شتێکی زۆر ئاساییە، ئاساییە بەو پێیەی لەنێو هاوەڵاندا زانای فەرموودە دەرکەوتووەو ڕەچەتەی

هاوەڵ و تـابیعینیش نووسـراوەتەوە، لەکتێبـەکانی پیاوناسـیدا(علم الرجـال)دا زۆر بــەجوانیی ئــەوە دەبینرێــت، ئــەی بــۆ لــەخۆت ناپرسیتەوە بۆ لەئێستادا تۆ ناتوانی کەسێکیان بۆ زیاد بکەی! بـۆ نەتپرسیوەتەوە سـوودی(متفق)و (مفترق)لەکتێبـەکانی پیـاو ناسـیدا چـییە؟ توێـژەکانی هـاوەڵانیش لەشـارو وڵاتانـدا خزمـەتی زۆریـان کـردووەو لەهـەواوە فـەرموودە وەرنـەگیراوە، بـەڵکو کۆڕو ئەڵقـەی زانسـت هــەبووەو ئیجـازەو موناوەڵـەو شـێوەکانی تـری ڕێگـەدان بەگێڕانەوەی فەرموودە هەبووە.

**لەبەشـی دوودا** کـە لەوەرگێڕانەکـەدا نەسـکی دووەم نووسـراوە، تایبـەت کـراوە بەناونیشـانی بوخـاری و قورئـانی پـیرۆز و چـەند فەرموودەیـــەکی بوخـــاریی هێناوەتـــەوە تایبـــەت بـــەقورئان و دەڵێ(ئایەتـەکانی قورئـانی پـیرۆز کـە زیـاتر لەشـەش هـەزار ئایـەت دەبـــن، نـــاکرێ بـــەو ژمـــارە کەمـــە ڕاڤـــە بکـــرێن، کـــە نزیکەی(٢٧٦٢)فەرموودەیەو کۆی ئەوەیە کە لەسـەحیحی بوخاریـدا هاتووە...لا٤١٧.

وەڵام: زەکـەریا ئـۆزۆن خـراپ خـۆی خسـتووەتە گێـژاوەوە، یـان گێلانە قسە دەکات یان دەیەوێ خەڵکیی گێل بکات، خودی پێشـەوا بوخـاریی دەڵـێ: ئـەم فەرموودانـەم لـەنێو زیـاتر لەشەسـت هـەزار فەرموودە دەرهێناوە، هەر فەرموودەیەکم نووسیبێتەوە پێشتر دوو

ڕكـات نوێـژم كـردووه.[1].....بوخـاریی ڕێسـای تایبـەتی هـەبووە بـۆ نووسینەوەی فەرموودە کـە زانایـان بەدروسـترین شـێواز دایاننـاوە، نەیووتووە فەرموودەكانی تر نادروسـتن، تانـەی لەهـەوڵ و كۆششـی هیچ زانایەك نەداوە، نەیووتووە ئەوەی لای من نەبێ فەرموودە نییە تا ئێمەش تانەی بۆ بخەینەسەر، سیحاحی تـرو سوونەنەتی تـر زۆر هەیـەو لای ئـەهلی سـووننە جێـی ئیعتیبـارن، بـەڵام كـارو كۆششـی بوخـــاریی لەهـــەموویان دروســـترە، وتمـــان دروســـتتر، كـــەوابوو دروســـتیش هەیـــەو بـــەراورد بـــەزانایانی تـــر بوخـــاریی ئـــەمیری فەرموودەناسانە.

ناكرێ بۆ هەموو ئایـەتێك هۆیـەك هـەبێ، دابـەزینی هـەموو قورئـان بەپێی ڕووداوو پرسیار نییە، سـەرەتا بەباسـی بیروبـاوەڕو ئیمـان و واجیبـات و شـەریعەتی خـواوە دابـەزی لەبابـەت تـاك و كۆمەڵـدا، (الجعبري)دەڵێ: قورئان بەدوو بەش دابەزیووە: بەشێكیان لەپێش و بەشێكی تری بەدوای ڕووداوو پرسیاركردن[2].

**لەلاپەڕەی دواتردا زۆربەی ئـەو شـتانەی لـەبارەی هـۆی دابەزینـەوە هاتوون، بەهیچ نیین و بۆچوونی هاوەڵان وەسفی دەكات.**

[1] - بڕوانـــە: نيل الأوطار ى الإمام محمد بن علي بن محمد الشوكاني. ج١، ص٢٢، دار الحديث القاهرة ١٤٢٦هـ- ٢٠٠٥م.

[2] - بۆ ئەمە بڕوانە: مباحث في علوم القرآن: مناع القطان.

وەلاّم بۆ ئەمە قسەی(الزركشي)ە کە دەڵێ:((لەنەریتی هاوەڵان و تابیعیین دەزانرێ کە دەڵێن ئەم ئایەتە لەوەدا دابەزیووە مەبەستیان حوکمەکەیەتی، نەك ئەوەو فلاّن بووەتە هۆی دابەزینی، قسەی ئەوان لەڕووی بەڵگەهێنانەوەیە بۆ حوکمدان..[1].

دواتر کۆمەڵێ فەرموودەی هێناوەتەوە وەك ئەوەی بەڵگەی ناتەواویی دۆزیبێتەوە! قسەو بۆچوونی زانایانی وەرنەگرتووە دواتر بەبیرکردنەوەوە شتێك بڵێ، ڕەنگە بۆ ئەم کارەشی چاوەڕێی دیاری و بەخشش بووبێ، چوون ئەم توانیویێتی هەڵەو کوموکورتی لەزانایانی تەفسیرو فەرموودەو مێژوو زمان و سیرە بگرێ!

لەبارەی یەکەم ئایەتی قورئانەوە دوو فەرموودەی بوخاریی هێناوەتەوەو بەعەقڵی خۆی! وەهای زانیووە دژ یەکن، ئەوەی یەکەم کە پەیامبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەئەشکەوتی حیرادا بۆ یەکەمجار جیبریل هاتووەتەلای و داوای لێ کردووە بخوێنێ و پەیامبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموودەیەتی: من خوێندەوار نییم......تا کۆتایی فەرموودەکە کە ئێمە لێرەدا تەنیا وەلاّمدانەوەمان لەسەرەو ئەم ئایەتەی بۆ دابەزاندووە:﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ۝٢ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ۝٣ ﴾ العلق: ١ – ٣، فەرموودەیەکی تری هێناوەو داوا دەکات یەکێکیان ساغ بکرێتەوە! ئەویش فەرموودەکەی جابری کوڕی

---

[1] - بڕوانە: لباب النقول في أسباب النزول ی پێشەوا سیوطي.

عبداللەی ئەنصارییە و تیایدا هاتووە یەکەمین شتێك لەقورئان دابەزیبێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ ﴾ المدثر: ١، وەلاّم بۆ ئەمە:دەبێ ئەوە بزانین جیاوازیی بکەین لەنێوان یەکەم ئایەتی دابەزینراو و یەکەم سورەتێ کە ئایەتەکانی پێکەوە دابەزێندراون، ئەو ئایەتانەی سورەتی(العلق)یەکەم ئایەتی دابەزێنراون، پرسیاری ئەوە لەجابر کراوە کە یەکەم سورەتێ تەواوی ئایەتەکانی پێکەوە دابەزێندراون کامەیە؟ ئەویش فەرموویەتی:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ ﴾ە، جابر لەبارەی ماوەی وەحییەوە دواوە، شێوەی ئەمجارەی جیبریل جیاواز لەوی پێشتر بووە بۆیە ترساوەو گەڕاوەتەوە ماڵەوەو فەرموویەتی داپۆشن داپۆشن...لەمەشدا هیچ دژیەکییەك بوونی نییە. بەتەماشاکردنی ژیاننامەی پەیامبەری خواو شێوازەکانی هاتنی وەحی بۆی، ئەو ڕاستییە ڕووندەبێتەوە کە بیری ئۆرزۆنی تەنیووەو عەودالّی گەیشتنە حەقیقەتە!

لەباسی دووەمدا هاتووەتەسەر دوا ئایەتی قورئان و سێ فەرموودەی بەنمونە هێناوەتەوە، ئەوەی یەکەم: پیاوێکی جولەکە بەعومەری کوڕی خەتابی وتووە ئەی ئەمیری ئیمانداران(وەرگێڕ بەبێ هۆی نیشانەی سەرسامیی ! لەبەرانبەردا دانـاوە، نـازانم بەچـی بۆنەیەك!)ئایەتێ لەکتێبی ئێوەدا هەیە گەر بۆ ئێمەی جولەکە دابەزیبایە، ئەو ڕۆژەمان دەکردە جەژن، عومەر دەڵێ کام

ئایـــــــەت؟دەڵێ: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ﴿٣﴾ ﴾ المائـــدة: ٣، واتا:ئـــــەمڕۆ ئـــاین و بەرنامەکەتانم بەکۆتایی گەیاندو نازو نیعمەتی خۆمم بۆ تەواوکردن و ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامەو دین و ئاینتان.

فەرموودەی دووەمیش ئەوەی ئیبن عەباسە کە وتوویەتی: ئایەتی: ﴿ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدٗا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمٗا ﴿٩٣﴾ ﴾ النساء: ٩٣، واتا:هەر کەسێك بەدەستی ئەنقەست ئیمانداریك بکوژێت(بەحەلاڵی بزانێت)، ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە، نەمرە تیایدا، هەروەها خوا لێی تووڕە بووەو نەفرینی لێکردووەو سزایەکی گەورە و بێ سنووری بۆ ئامادە کردووە.

ئـیبن عـەباس وتوویـەتی: دوا ئایـەت بـووە کـە دابـەزیووەو هـیچ ئایەتێکی دیکە هەڵینەوەشاندووەتەوە.

سێیەم فەرموودەش فەرموودەکەی بەرائە کە دەڵێ: کۆتـا سـورەتی دابەزێنـدراو سـورەتی(بـراءة)یـەو کۆتـا ئایـەتیش: ﴿ يَسۡتَفۡتُونَكَ ﴾ النساء: ١٧٦.

وەڵام: ئایەتەکەی سورەتی مائیدە لەعەرەفەو لەحـەجی ماڵئاواییـدا دابەزیووە، بەڵگەی کامڵ بوونی فەرائیزو ئەحکامەکانە، ئەو کاتەی کـە دابـەزی، خـوای گـەورە هـەموو حوکمـەکانی بەموسـڵمانان گەیانـدبوو لەڕێگـەی پەیامبەرەکەیـەوە، بۆیـە ئامـاژەی پێـدان کـە

ڕەنگە سالێکی تر لەم کاتانەدا پێیان نەگاتەوە. خوای گەورە موسڵمانانی توانادار کردو نیعمەتی سەرکەوتنی پێ دان مەککە ڕزگار بکەن و بێ هاوبەش پەیداکەران حەج بکەن و هاوبەش پەیداکەرانی لێ دووربخەنەوە.

بۆ ئایەتی:﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾ ﴾ النساء: ٩٣، وتراوە:قسەی ئیبن عەباس ئەوە بووە، کۆتا ئایەتێك لەبارەی کوشتنەوە دابەزی بێ ئەم ئایەتەیەو ئایەتی تر دانەبەزیووە هەڵیوەشێنێتەوە.

ئەوەی بەرائیش ئەوەیە: کۆتا ئایەتێك لەبارەی میراتەوە دابەزیی بێ ئایەتی(١٧٦)ی سورەتی نیسائەو کۆتا سورەتێکیش پێکەوە دابەزی بێ سورەتی بەرائەیە. ئیتر نازانم دیاریی کردنی سەرەتاو کۆتا ئایەت چی بەربەستێکی لەبەردەم زەکەریا ئۆزۆندا دروست کردووە تا پەیڕەوی ئیسلام بکات؟!

لەبابەت سێهەم: گەڕانەوە سەرو پێداچوونەوە لەقورئانی پیرۆزدا لا٥٦ئەو ئایەتەی هێناوەتەوە کە دەفەرموویێ:﴿ وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ﴿١٨٧﴾ ﴾ البقرة: ١٨٧، واتا:دە بخۆن و بخۆنەوە هەتا بەڕوونی بەرەبەیان و سپێدەتان بۆ دەردەکەوێت و لەڕۆژهەڵاتەوە دیار دەدات و تاریکی

شەو لا دەبات، لەوەودوا ڕۆژووەکەتان ببەنە سەر تا شەو دادێت و (خۆرئاوا دەبێت).

بێ تێگەیشتن لەقورئان و ڕووە ڕەوانبێژییەکەی و نەریتی عەرەب لەهەندێ دەستەواژە، هاتووە هەڵە تێگەیشتنی هەندێ هاوەڵی قۆستووەتەوە کە تاڵە دەزووی ڕەش و سپییان لەقاچیان دەبەست، دواتر خوای گەورە (مِن بی)ی دابەزاند تا بۆیان ڕوونی بکاتەوە مەبەست تاریکو ڕوونی شەوو ڕۆژە. زەکەریا ئۆزتۆن لەبابەت ئیستیعارە تێنەگەیشتووە کە عەرەب بەرەنگی بەریەیان و ئێوار بوونەوە وتوویانە دەزووی سپی و ڕەش[1] و ئەو هاوەڵە لەو ئیستیعارەیە نەگەیشتووە، خوای گەورەش (مِنَ ٱلۡفَجۡرِۖ)ی دابەزاندووە، ئەمەش شتێکی ئاساییەو دەمدرێژییەکە هی زەکەریا ئۆزتۆنە نەك فەرموودەکە، خوای گەورە هیچی لەبیرنەچووەو ناچێ، ئەگەر هۆش و بیری هەبوایە لەڕێگەی زاناو ڕاڤەکارانی قورئانەوە لەزیاتر ڕوونکردنەوەکانی قورئان تێدەگەیشت.

لەفەرموودەی(۲)لا۵۸ ئانەیەکی دیکە دەخاتەسەر فەرموودەیەك کە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاندووە: ﴿ لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡقَٰعِدُونَ مِنَ

---

[1] - بڕوانە: غرائب القرآن ورغائب الفرقان:نظام الدين الحسن بن محمد بن حسين القمي النيسابوري (المتوفى: ٨٥٠هـ)، المحقق: الشيخ زكريا عميرات، ج١، ص٥١٤، ط١، ١٤١٦هـ، دار الكتب العلمية – بيروت.

ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٩٥﴾ ﴾ النسـاء: ٩٥، واتـا: ئەوانـەی لـەباوەڕداران کـە دانیشتوون وەك ئەوانە نین کە دەجەنگن.

ئیبن مـەکتوم کـە هـاوەڵێکی بـەڕێز بـووەو نابینـابووە دێتـەلای پەیامبـەری خـوا (صـلی الله علیـه وسـلم) و بـاس لـەنابینایی خـۆی دەکات کە ناتوانێ بەهۆی نابیناییەکەیەوە بەشداری شەڕبێ، ئینجا ئایەتەکـە بـەمجۆرە دابـەزیووە:﴿ لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ غَيۡرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ﴿٩٥﴾ ﴾ النسـاء: ٩٥، واتـا: ئەوانـەی لـەباوەڕداران کـە دانیشـتوون وەك ئەوانـە نـین کـە دەجـەنگن، مەگـەر ئەوانـەی کـە ناتەواون(کوێرن، شەلن، نەخۆشن، هتد).

ئەگەر لەحیکمەتی ئیسلام و بەیەکجاریی دانەبەزینی قورئان بڕوانێ و هاوپۆلـەکانی بـڕوانن، بـاش دەرك دەکـەن ئەمـە نـە عەیبەیـەو نەفریاکەوتنـە، بـەڵکو بەشـێك لەئایـەت و فـەرموودەکان بـۆ شیکردنەوەی حوکمی ڕووداوی نوێ و پرسیاری هـاوەڵان و کەسـانی ترە کە تا مرۆڤ لەسەر زەویدا هەبێ دوبارە دەبنەوە.

هەر لەم ئایەتەو ئایەتی زیهارو لیعان و شتەکانی تر، ئـەم ئایەتانـە بەهۆیەکـەوە پەیوەسـت بوونـەو لـەژیانی هەنـدێك لەهاوەڵانـدا ڕوویانداوەو لەژێر تیشکی حوکمەکەیدا کێشەی خۆیانیـان چارەسـەر کردووە، جا گێڕانـەوەی فەرموودەکـە حوکمەکـەی زیـاتر ناوبـانگتر کردووە، بەتایبەت ئەوەی ئیبن مەکتوم(خوای لێ ڕازی بێ)چـووەتە

نێو ژیاننامەی پەیامبەری ئازیزەوە (صلی الله علیه وسلم) و بووەتـە حوکمێکی گشتیی بۆ ئەوانەی هەمان حاڵەتیان هەیە.

**لەفەرموودەی(٣)** لاپەڕە ٥٩دا فەرموودەکـەی بـەرائی هێناوەتـەوە کـە بـاس لـەوە دەکـات ئەنسـارییەکان لەسـەردەمی جاهیلییـدا نـەریتییان وەهـابوو لەحـەج بگەڕابایانـەوە لەپشـتەوە دەهاتنـە ماڵەکانیانەوە نـەك لـەدەرگای حەوشـەوە، بۆیـە خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـدووە:﴿ وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ ﴿١٨٩﴾ ﴾ البقـرة: ١٨٩، واتا: چاکەو چاکەکاریش ئەوە نییە کە لەپشتەوە خۆتان بکەن بەماڵاندا(کە ئەمە کارێك بوو لەسەردمی نەفامیدا ئـەنجام دەدرا دوای گەڕانەوە لەحەج)بەڵکو چـاکە ئەوەیـە کـە ئـەو کەسـە لـەخواترس و پارێزکاربێ.

لەلێکدانەوەکەدا نەفامانە ئەنسارییەکانی بەنەفام داناوە، لەکاتێکـدا نەفام ئەو مرۆڤەیە خوا عەقڵی پێ داوەو دان بەهەڵەی خۆیدا نـانێ و ملکەچـی فرمـانی خـوا نـابێ کـە ڕاسـتەقینەیەو گومـان هـەڵناگرێ، کەچی لەهەوڵدایە گەوجی هاوشێوەی خۆی زیاد بکات! ئینجا بـاس لەوە دەکات ئەمە بۆ ئەمڕۆ چـی سـوودێکی هەیـە ئـەم فەرموودەیـە بگێڕدرێتەوەو مرۆڤەکان ئەمڕۆ لەباڵەخانەکاندا دەژین!

دیارە وا دەزانـێ هـەموو خـەڵك لەباڵەخانـەدا دەژی! دێهـات و ماڵـە هەژارەکان نابینن کە زۆرینەی خەڵکی وڵاتی ئەو و خاکی موسڵمانن،

ئەوەشی بیرچووە نەریتی جاهیلی و دوور لەئیسلام حەقی بەسەر بوونی باڵەخانەو شتە مۆدێلییەکانەوە نییە، لەمڕۆشدا هەندێك مرۆڤی مۆدێرنەو خاوەن باڵەخانە کە زەکەریا ئۆزۆن شانازیی پێیەوە دەکات خۆی تووشی نەخۆشیی دەروونیی کردووە و بەحیسابی بورجی کیسەڵەکەی هەنگاو دەنێ!

لەلاپەڕە(٦١) ئەمە هەیە: دووەم: هەڵوەشاندنەوە لەئایەتەکانی قورئاندا: ڕەخنە دەگرێ لەحوکمی ڕەجمکردنی هەر ژن و پیاوێك کە یەکجار جووتبوونی شەرعییان ئەنجامدابێ و دواتر داوێن پیسیی بکەن و بەچوار شایەت ساغ بێتەوە ئەو تاوانەیان ئەنجام داوە تا مردن بەردباران دەکرێن، ڕەخنە دەگرێ بۆ حوکمەکە ماوەوەو ئایەتەکەش نەماوە، دواتر حوکمەکەی گێڕاوەتەوە بۆ سەر ژن و پیاوی پیر، ئینجا دەڵێ: فەرموودەکە قسەی عومەرە نەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) .
وەڵام: یەکەمجار دەبێ بزانێ حوکمەکە هی پێشەوا عومەر نەبووە، ئەگەر حوکمەکە هی ئەو بوایە، ئەوە لەسەر مینبەرەوە ئەم حوکمەی نەدەداو هاوەڵانیش بێ دەنگ بن، بێدەنگ بوونیان بەرانبەری نیشانەیەکی ڕوونە لەوەی باش زانیویانە حوکمی خوایەو واقیعیی بینیویانەو لایان بووەتە موتەواتیر. ئەگەر ئەم حوکمە لەخۆیەوە سەرچاوەی بگرتبایە وەك ئەوەی لەسەر مینبەرەوە ئەندازەی مارەیی دیاریکرد و ئافرەتەکە هەڵساو ڕەتیکردەوە،

بەحوکمی ئەوەی خواو پەیامبەرەکەی (صلی الله علیە وسلم) ئەمەیان دیاریی نەکردووە بەچی حەقێك ئەو دیاریی ئەکات، پێشەوا عومەریش لەو دیارییکردنە پاشگەز بوویەوە، ئاوەها کەسێك هەڵدەستاو حوکمەکەی ڕەتدەکردەوە، بەڵام نەخێر، هاوەڵان لەو حوکمە دڵنیابوونە.

ئینجا لەلاپەڕە(٦٦) تۆمەتێکی زۆر ناشیرینی خستووەتە پاڵ ئیسلام و لەبابەت داوێن پیسییدا دەڵێ: سزای نێرینەکان بەئازاردانەو دەرگای تەوبەو چاکبوونیش بەڕوویاندا کراوەیە، بەڵام سزای ژنان بەردباران کردنە.
ئەمە چی دڵسۆزێکی دۆسییەی ژنانە! ئەم مرۆڤانە شەرم دایانناگرێ، هەموو کەس دەزانێ لەئیسلامدا تەوبە بۆ هەموو کەسێکە، خودی ئەو ئافرەتەی هاتەلای پەیامبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) و وتی:من داوێن پیسییم کردووەو حوکمی خوام لەسەر بەجێبهێنە، دوای چەندان جار کە پەیامبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) دەیگەڕاندەوە تا منداڵی ببێ ئینجا شیری پێ بدات ئینجا لەشیریش بڕیەوە هەر هاتەوە تا لەو تاوانە پاکبێتەوە، لەکاتی بەجێهێنانی حەددی خوادا پەیامبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) چۆن وەسفێکی بو باوەڕداریتی و تەوبەو چاکەی ئەو ئافرەتە دەکات، بەڵام لەگوێیەکی کەڕو چاوێکی کوێرو زمانێکی لاڵ چی چاوەڕێیەك دەکرێ!.

لەلاپەڕە(٦٧)دا گومانێکی کردووە کە ڕەنگە هاوەڵان ئەم حوکمەیان لەتەوراتەوە وەرگرتبێ.

وەڵام: گومان لەوەدا نییە کە لەتەوراتدا هەمان حوکم هەیەو پەیامبەریش (صلی الله علیە وسلم) ئەمەیانی بیرخستووەتەوە کە لەنێو خۆیاندا بەسەر کەسانی لاوازو بێ بنەماڵەدا ئەنجامی دەدەن، بەڵام لەخودی ژیانی پەیامبەردا (صلی الله علیە وسلم) ئەم حوکمە وەك حوکمەکانی تری ئیسلام جێبەجێکراوە، جێبەجێکردنیشی هەڕەمەکییانە نییە، دەبێ بەچوار شایەتی سەرڕاست ساغ بێتەوە ئەو تاوانە ئەنجامدراوەو لەگەڕانەوە بۆ حوکمی فیقهیی ئەم حاڵەتە شتی زۆرتر ڕووندەبێتەوە.

لەفەرموودەیەکی تردا کە حەفتا هاوەڵی پەیامبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) شەهید دەکرێن لەلایەن (رعل و ذکوان)ەوە، ئایەتێك خوای گەورە لەسەر زمانی ئەو هاوەڵانە دادەبەزێنێ کە خوایە گیان بەقەومەکەمان هەواڵ بدە کە ئێمە بەپەروەردگارمان گەیشتینەوە. دواتر ئەم ئایەتە بەفرمانی خوای گەورە سڕاوەتەوە. دەپرسێ:کوا ئەو قسەیەی پێغەمبەر کە باس لە سڕینەوەی ئەم ئایەتە دەکات و بوخاریی بۆ وردتر لەمەی نەکۆڵیوەتەوە؟

ئەم مرۆڤە نەیڕوانیوەتەوە زانستی قورئان و بزانێ بەچ پێوەرێك هەڵوەشانەوە دەسەلمێندرێ، چی پێویستییەك دەکات بوخاریی یان ئەوەی پێشتر بسەلمێنێ ئەوجار ئەمە بنووسێتەوە یان

دەستبەرداری ئەمەش بێ؟! ئەمە ئایەتێك بووە بەخوێندەوەش هەڵوەشاوەتەوە، لەکاتێکدا دەبینین کە پەیامبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ ماوەی یەك مانگ لەنوێژەکانیدا دوعای لێخۆشبوونی بۆ ئەو هاوەڵانەی کردووەو دژ بەدەستدرێژیکارانی سەر ئەو حەفتا هاوەڵەی پاڕاوەتەوەو کارەساتێکی گەورە بووە بۆ سەر دەروونی خۆی و موسڵمانان، ڕەنگە دابەزینی ئەو ئایەتەش بۆ دڵنەوایی بووبێ و دواتر بەحیکمەتی خوای گەورە هەڵوەشاوەتەوە.

**لەلاپەڕە(٧١)دا** ئەم فەرموودەیەی هێناوەتەوە: ((عن عائشة قالت: سمع رِسول الله رِجلا يقرأ في المسجد فقال يرحمه الله لقد أذكرني كذا وكذا، أسقطهن من سورة كذا و كذا.

کوردییەکەی وەهای نووسیوە: عائیشە دەڵێ:پێغەمبەر(د.خ)گوێی لەپیاوێك بوو لەمزگەوتدا قورئانی دەخوێند، وتی: ڕەحمەتی خودای لێ بێت، فلانە ئایەت و فلانە ئایەتی وەبیرهێنامەوە، کە لەفلانە سورەت و فلانە سورەتدا لەبیرم کردبوون. لا٧١.

وەلام: سەرەتا دەبێ ئەوەی ڕوون بکردبایەتەوە و ڕاستگۆ بوایە لەگەڵ خۆیدا و بەجۆرێکی تر لێکدانەوەو دابڕان نەکات لەو بابەی بوخاریی دایناوە (باب من لم یر بأساً أن یقول سورة البقرة وسورة كذا وكذا)، واتا: بەشی ئەوانەی بەکێشەی نازانن بڵێن سورەتی بەقەرەو سورەتی فلان و فلان.

ئینجا تەماشایەکی یەکەم فەرموودەی ئەو بەشەی بکردبایە کە باس لەوە دەکات دوو ئایەتی سورەتی بەقەرە هەیە هەر کەسێ لەشەودا

بیخوێنێ لەجنۆکە پارێزراو دەبێ، ئەم فەرموودەیەش کە ئەو هێناویەتییەوە لەشەودا بووە لەمزگەوت پەیامبەر (صلى الله علیه وسلم) گوێی لێ بووە و ئەم دوعایەی بۆ کردووە کە یادی خستووەتەوە ویردی ئەو شەوەی بخوێنێ و فەرموویەتی:((یرحمه الله لقد أذكرني كذا وكذا آیة أسقطتها من سورة كذا و كذا. ئینجا(أسقطتها) واتای لەبیر چوونەوە نییە، بەڵکو پەیامبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) ئەمەی مەبەست بووە: خوای گەورە ڕەحمی پێ بکات ئەمشەو فلاّنە ئایەتی یادم خستەوە کە لەفلاّنە سورەت و فلاّنە سورەت دامناوە.

دواتر لەبەشی سێ و لەلاپەڕە(٧٥)باس فەرموودە قودسییەکانی کردووەو چەند فەرموودەیەکی هێناوەتەوە بەگومانی خۆی بۆ گەیشتنە بەکاریگەرییان لەسەر ئایینی ئیسلام!
فەرموودەکان تایبەتن بەسیفەتەکانی خوای گەورەو بەشێك لەمەزهەبە بیروباوەڕییەکان قسەی خۆیانیان تێدا هەیە، بەلاّم لای ئەهلی سوونەو جەماعە هەموو سیفەتەکانی خوای گەورە دەسەلمێنین بەبێ شوبهاندن و لەکارخستن، وەك خۆی باوەڕمان پێی هەیە و زانایانی ئەهلی سوونەش دانراوی نایابیان لەو بارەیەوە هەیە وەك(الرسالة الحموية الكبرى)شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییەو تەعلیقاتی شێخ ئیبن باز لەسەر (فتح الباري) و پێویستمان بەلێکدانەوەی فەلسەفیی و ڕێچکەی ئەملاو ئەولا نییە کە خودی

زەکەریا ئۆزۆن باوەڕی بەهیچیان نییە. سەیرە کەسە ئیلحادەکان هەندێجار بیریان بۆ لای ئەوە دەچێ خوامان پێ بناسێنن!

ڕەتیدەکاتەوە هاوواتایی لەزماندا هەبێ و ڕەتی دەکاتەوە(متکبر و متجبر)هاوواتابن، گریمان هاوواتای سەدا سەد بوونی نەبێ، بەلأم دەبێ ئەوە بزانین هەندێ وشە واتای یەکتر هەڵدەگرن بەزۆریی یان کەم، هەموو خۆ بەزلزانێك زۆرداریی تێدایەو هەموو زۆردارێکیش خۆبەلزانێی تێدایە بۆیە بۆ ڕاستیی مل نادات، لەهەمووی زۆرتر ئەو خۆبەزلزانەیە کە بەهۆی خۆبەزلزانییەوە هەردوو چاو و دڵی کوێر بووە لەئاست وەرگرتنی باوەڕ و داننان بەگەورەیی و کاملێی ئیسلام. ئەوەشی وتووە کە هەمیشە هەژاران لای خوا مەزن و پایەبەرز نین، ئایەتەکەش کە هێناویەتییەوە لەسورەتی نیسائدا باسی هەژاران نییە، بەڵکو لاوازو بێ دەسەلأتانە، بەئەندازەی باوەڕو گوێڕایەڵیی بۆ خوای گەورە مرۆڤ پایەدارێتیی لای خوا هەیە، جا دەوڵەمەندبێ یان هەژار، دەسەلأتدار بێ یان بێ دەسەلأت، ئەوەشمان بیرنەچێ هاتنی ئیسلام دەرکردن و ڕزگارکردنی هەژارو بێ کەسانی نمونەی بیلال و صوهەیب و کۆمەڵگەیەك بوو لەدەست زۆردارەکان، لەڕیزی موسڵمانەکاندا دەوڵەمەندانیش هەبوون، دەوڵەمەندییەکەیان کردە قوربانیی بۆ ئیسلام و پەیامە نەمرو مرۆڤدۆستییەکەی با ناحەزانیش دڵتەنگ بن.

لەبەشی(نەسکی)ســــێیەم لاپـــــەڕە٨٧ بـــــاس لــــەبوخاری و پێغەمبەر(د.خ)یە.

وتمان کە زەکەریا ئۆزۆن لەنێو سەحیحی بوخارییدا دەستەچنی ئەم فەرموودانـەی کـردووە بـۆ تانـەدان لەسـەحیحەکەی ئـەو پێشـەوایە، بەڵام دەبینین هـیچ بەرهـەمێکی ئـەو نیـازەی نەچـنیوەتەوە، قسـە لەسەر پێغەمبەرو ڕای بەرانبەر ئەکات کە پەیامبـەر (صـلى الله علیـه وسلم) بەهۆی ڕا جیاوازییەوە کەعبی کوڕی ئەشرەف و ئەبی ڕافیعی جولەکــــەی کوشـــــتووە، کەچـــی لەلاپــــەڕە(٩٩- ١٠٠)خـــۆی بەدرۆخسـتووتەوەو دەڵـێ: تەنانـەت لەفەرموودەکـەی (بوخـاری)دا هەیە لەکەسێك خۆشبووە کە ویستوویەتی بیکوژێ)بەڵێ نمونەی ئەم لێخۆشبوونەی پەیامبەر (صـلى الله علیـه وسـلم) زۆر زۆرە، لەهاتنـە مەدینەو نووسینەوەی دەستووری مەدینەو پەیماننامەی نێوان خـۆی و جولەکە زۆر جار ئەم لێبووردەییەی کردووە، بەشیعری حەسسـان وەڵامی هەجوەکانی کەعبی کوڕی ئەشرەفی داوەتـەوە، چاوپۆشـی کردووە لەهەر تانەو توانجێکی جولەکەکان و ڕێزی لێگرتـوون، بـەڵام دەبـوو زەکـەریا ئـۆزۆن ڕاسـتگۆیانە ڕووداوەکـەی بگێڕایەتـەوەو ڕوو پەلـەی نەکردبایـە بـۆ تانـەدان، هـەر نـەبوو وەك(جـۆن دیڤینبـۆرت) ڕاستگۆیانە باسی لەو خراپەییانەی جولەکەی بکردبایـە کـە بەرانبـەر پەیامبەر (صلى الله علیه وسلم) و هاوەڵانی دەیانکرد[١].

---

[١] - جون دیفینبورت: اعتذار لمحمد والقرآن.

پێشتر کەعبی کوڕی ئەشرەف لەپیلانگێڕییدا بەردەوام بوو بۆ گومان خستنە سەر پەیامی ئیسلام، دواتر کە قورەیش لەبەدردا شکستیهێناو دوو موژدەدەر کە زەیدی کوڕی حاریثە و عبداللەی کوڕی ڕەواحە بوون لەلایەن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وە هاتن بەموژدەی سەرکەوتنی موسڵمانان و شکستی هاوبەش پەیداکەران لەبەدردا، ئەم هەواڵە بە کەعبی کوڕی ئەشرەفی طائیی بنەچەو جولەکە بیروباوەڕی ئیبن نەضریەی جولەکەیی گەیشت و وتی: سوێند بەخوا ئەگەر موحەممەد ئەوانەی کوشتبێ–واتا ئومەییەی کوڕی خەڵەف و ئەبو جەهل و عوتبەی کوڕی ڕەبیعە– ئەوە ناوگۆڕ باشترە لەژیانی سەر زەوی و وەك خراپەی کەڵپەی سەگی هار وایەو دەستیکردە جنێودانە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و قسەی ناشیرینکردنە ژنانی موسڵمانان، پاشان ڕۆیشتە لای قورەیش و پیاوانی قورەیشی بانگکردو هەڵنا بۆ شەڕکردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ، ئەوانیش میوانداریان کردو لەگەڵیدا کۆبونەوەو خەریکی جنێودان بوو بەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و موسڵمانەکان، لەبارەی ئایینەکەیانەوە لێیان پرسی و وتی: ئایینی ئێوە باشترە لەئایینی موحەممەدو ئەو نەفرەتیە درۆو فێڵیکرد، بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی لەبارەوە دابەزاند:﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ

ءَامَنُواْ سَبِيلًا ﴿٥١﴾ ﴾،واتا:ئایا ئاوڕێکت نەداوەتەوە لەوانەی بەشێك لەنامەی خواییان پێدراوە بڕوا ئەهێنن بەشتی بێ نرخ و بەرنامەی غەیری خوا(بە جادووگەران و بەشەیتان)وە دەڵێن بەوانەی کە بێ بڕوان ئەوانە ڕێبازیان ڕاسترە لەوانەی کە باوەڕیان هێناوە.

کە گەڕایەوە مەدینەو خوای گەورە وەحی بۆ پێغەمبەرەکەی کرد کە کەعب چیکردووەو چی وتووەو پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) پێداگربوو لەسەری، کارێك بوو کوشتنی پێویست کردبوو، پەیمانی هەڵوەشاندبوو دوژمنانی بۆ سەر موسڵمانەکان هاندابوو، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەهەندێ لەهاوەڵانی فەرموو:((مَنْ لِي بابن الأشرف؟کێ تۆڵەم لەکوڕی ئەشرەف بۆ دەکاتەوە، موحەممەدی کوڕی مەسلەمە وتی: من تۆڵەت بۆ دەکەمەوە ئەی پێغەمبەری خوا، من دەیکوژم[1].

ئیبن خەلدونیش دەڵێ: دوای هەواڵی دۆڕانی قورەیش لەشەڕی بەدر زۆر خەفەتبار بوو، وتی: لەنێوبچن ئەمە ڕاستە کردووتانە، ئەوانەی قورەیش وا کوژراون گەورەی عەرەب و پادشایانی خەڵکین، ئەگەر موحەممەد ئەوانەی کوشتبێ، ئەوە گۆڕ باشترە لەژیانی سەر ڕووی زەوی، ڕۆیشتە مەککەو لایدایە ماڵ موتەڵیبی کوڕی ئەبی وداعەی

---

[1] - بۆ ئەمە بڕوانە: أبو بكر جابر الجزائري: چەند خۆشەویستە ئەم خۆشەویستە، و: عبدالله گەرمیانی، پێداچوونەوەی: د. کامران سعدالله زەنگەنە، لا٢٦٤.

سەلەمی و عاتیکەی کچی ئوسەیدی کچی ئەبی ئەلعیصی بەنی ئومەیەش لەوێ بوو، خەڵکیی هان دەدا دژ بەپەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) و شیعریی دەوتەوەو بۆ کوژراوانی قولەیب کە ئەبو جەهل و ئەوانی تر بوو دەگریا، پاشان گەڕایەوە مەدینەو دەستی دایە جنێودانە عاتیکە و ئافرەتانی موسڵمانان[1].

لەبەر بێ پەیمانیی و ناپاکیی بوو فرمانی کوشتنی درا، زەکەریا ئۆزۆنیش لەڕقی ئیسلام و فەرموودەدا چووەتە پەنای کەعبی ئەشرەف و خۆی بەمرۆڤدۆست کردووە لەکاتێکدا جنێودۆست و ناپاك دۆستە.

ئەبی ڕافیعیش نمونەی کەعبی کوڕی ئەشرەف بوو، ناوی سەلامی کوڕی ئەبی ئەلحوقەیق و خاوەن کونییەی ئەبی ڕافیع و جولەکە بوو، زۆر ئازاری پەیامبەرو هاوەڵانی دەداو دوژمنایەتییەکی سەرسەختانەی دەکردو قورەیشیی و بتپەرستەکانی بۆ سەر مەدینەو پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆکردەوەو یەکێك بوو لەوانەی سوپاکانی بۆ سەر مەدینە هانداو قورەیزەییەکانیشی هاندا لەپەیمانی خۆیان پەشیمان ببنەوەو مەدینەو موسڵمانەکان کەوتنە مەترسییەوەو خوای گەورە پاراستنی[2] جا مرۆڤێکی سەرسەخت لەنمونەی ئەبی ڕافیع کە هەوڵی لەنێوبردنت بدات چۆن مامەڵەیەکی لەتەکدا دەکرێ؟

---

[1] - بڕوانە: تاريخ ابن خلدون، ج٢، ص٤٣١ی دار الفكر.

[2] - بڕوانە: البداية والنهاية، ج٤، تاريخ ابن خلدون، ج٢.

لەوەڵامی ئەوەی گوایە خەزرەجییەکان لەنێو خۆیاندا وتبێتیان با ئەوسییەکان پێشمان نەکەون لەکوشتنی ئەبی ڕافیعداو خۆمان بەو کارە هەڵسین، ئەوە ڕاستتر ئەوەیە کە ئیبن خەلدون وتوویەتی: ئەوس و خەزرەج وەك دوو گای بەهێزبوون(الفحل) لەگوێڕایەڵیی پەیامبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) و بەرگریان لێ دەکردو تۆڵەیان لەدوژمنەکانیان بۆ دەکردەوە[1] پێشبڕکێیان بوو بۆ کاری باش بەنییەتی بۆ خوا سوڵحایی نەك ئەوەی زەکەریا ئۆزێن گومانی کردووە.

**لەفەرموودەی(٣)** لاپەڕە ٩٨، باس دەکات لەبڕیاری کوشتنی(ابن خطل)لەلایەن پەیامبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) ، جارێك ڕەخنە دەگرێ چۆن بوخاریی ئەم باسەی لەبەشی(جزاء الصید)پۆلێن کردووە، جارێکی تریش ك پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەرکەسێ دژی وەستابێتەوە کوشتوویەتی.
ئەوەی بوخاریی کە لەو بەشەدا دایناوە، مەبەست ڕاو و کوشتنی مرۆڤ و هەر ئاژەڵێکی تر بێ لەسنووری حەرەمدا، ئینجا پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەبەر خودی خۆی بڕیاری کوشتنی(ابن خطل)ی نەداوە، ئەمەی زەکەریا ئۆزێن وتوویەتی تۆمەتێکی نابەجێیە، خۆی لەتۆزی گومان و بێباوەڕییدا گەوزاندووە، ئەگەر

---

[1] – تاریخ ابن خلدون، ج٢، ص٤٣٣.

تەماشـایەکی(فتح الباري بشرح صحیح البخاري) بکردبایـە، بـۆی ڕووندەبوویەوە کە هۆکاری ئەو بڕیارە بۆ چییە؟

(ابن خطل) پێشتر موسڵمان بوو، پەیامبەری خـوا (صـلی الله علیـه وسلم) پیاوێکی ئەنسـاریی لەگەڵـدا نـارد بـۆ کارێـك، خزمـەتکارێکی موسڵمانیشـی لەگەڵـدا نـارد، دابەزینـە شـوێنێك و فرمـانی بەخزمەتکارەکـە دا سـابرێنێك سـەر ببڕێ و خـواردنێکی لـێ ئامـادە بکـات، خـەوت و دواتـر هەڵسـا بینـی خزمەتکارەکـە هیچـی لـەوەی نـەکردووە کـە فـەرمانی پـێ داوە، لێـدانی کـردو کوشـتی و پاشـان لەئیسـلام هەڵگەڕایـەوەو بـووە هاوبـەش پەیداکـەر، دوو ئـافرەتی خزمەتکارو گۆرانیبێژی هـەبوو گـۆرانیی خراپییـان بەسـەر پەیامبـەر (صلی الله علیه وسـلم) دەوت، هۆکـاری کوشـتنەکەی لەتۆڵـەی ئـەو خزمەتکارە موسڵمانەدا بوو، بۆیە لێبووردنی پەیامبەری خـوا (صـلی الله علیـه وسـلم) بـۆ خـەڵکی مەککـە ئـەو و چـەند کەسـێکی تـر کـە ڕەنگـە(٥)کـەس بـن نەگرتـەوە، چـونکە تاوانبـار بـوون و تـەویـەیان نەکرد[1].

یەکێك لە هەرە بێ ڕێزییەکانی وەك زەکەریا ئۆزۆن ئەوەیـە، پێیـان گرانە هیچ هەڵوێستێك لەبەر خودی پەیامبەر (صلی الله علیـه وسـلم) بنووێندرێ، قودسییەتی بۆ دانانێن، چونکە عەقڵ و هۆشـی ئـەوان نەگەیشتووەتە ئاست عەقڵ و هۆشی منداڵێك کـە جـارێ بـەزۆر شـت

[1] – بڕوانـە: فتح الباري بشرح صحیح البخاري للإمام أحمد بن علي بن حجر العسقلاني. مع تعليقات العلامة عبدالعزيز بن باز، مكتبة الصفا.

ئاشنا نەبووە. لەپاڵ ئەم بیانووەدا بەردی گەورە هەڵدەگرن و بێ فامانە قسە بەگەورەیی پەیامبەری ئیسلام موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دەڵێنەوە، وتراوە(دەریا بەوەڕینی سەگ پیس نابێ)بەلاّم ئەوە هەیە و دەبێ لەخودی ئەو کەسانە بپرسین: کام وڵات و تاقم و گرووپ هەیە قبوڵی بێ سووکایەتی بەقوربانی و سمبولەکانییەوە بکەی؟ کام لەئێوە ئامادەیە قسە لەسەر باوك و باپیرو ناموسییەوە بکەی؟کام لەئێوە بوێریی ئەکات لەوڵاتێکی تردا ڕەخنەو ئەو سوکایەتییەی بەرانبەر بەئایینی ئەو وڵاتە دوبارە بکاتەوە، ئەورووپاتان بێ یان وڵاتێکی تری ئاسیا کە بوزی و هیندۆسی و ئەوانی ترتان بێ؟! لەکاتێکدا دەزانن بەلای موسڵمانانەوە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) لەسەرووی هەموو قوربانیی و سمبولێکەوەیەو ڕەخنەکانیشتان ئەوەندە بۆ بێ ڕێزییە تۆزقاڵێك بۆ گەیشتنە حەقیقەت و بەرچاو ڕوونبوونەوە نییە.

**لەلاپەڕە١٠١** باسی لەشکر کێشی ئەکات و ئەم فەرموودەیەی بەفەرموودەی ئەمەوی داناوە نەك نەبەوی[١]: "أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ مِنَ الأَنْبِيَاءِ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، فَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ فَلْيُصَلِّ، وَأُحِلَّتْ لِيَ الْغَنَائِمُ، وَلَمْ تُحَلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي، وَأُعْطِيتُ

[١] – ئەم فەرموودەیەی لێرەدا نووسیومە گێڕانەوەیەکی ترە، تا بزانن زیاد لەیەك گێڕانەوەی هەیەو دروستکراو نییە، نەبەوییە نەك ئەمەوی!

الشَّفَاعَةَ. وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً"، واتا: پێنج شتم پیّ دراوه بەهیچ لەپەیامبەرانی پێش خۆم نەدراوه: لەدووریی مانگە ڕێیەکەوە دوژمنم لیّ ترسێندراوه، زەوییم بۆ کراوەتە شوێنی نوێژو پاکیی، هەر کەسێکی ئوممەتەکەم بەکاتی نوێژ گەیشت لەهەر کوێدا بوو با نوێژ بکات و ڕەوایە، غەنیمەتەکانی شەڕم بۆ حەلاڵ کراوه کە بۆ پەیامبەرانی پێش من حەلاڵ نەبووە، شەفاعەتم پیّ دراوه، پەیامبەران تایبەت بۆ هۆزو قەومی خۆیان هاتوون و منیش بۆ تێکڕای خەڵکیی نێردراوم.

زەکەریا ئۆزۆن وەك ڕۆژهەلاتناسەکان دەیەویّ لەپاڵ ڕەتکردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا جیهانێتیی ئیسلام ڕەتبکاتەوه، جا بەڕێگەی ترو خۆڵ بەچاودا کردن!

(نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ) مەبەست پێی لەشکرکێشیی نییە، بەڵکو موژدیەکە بەهاوەلاّن کە جارێکی تر نمونەی شەڕی خەندەق ڕووناداتەوه کە بێباوەڕو هاوبەش پەیداکەران گەلەکۆمەکێتان لەسەر بکەن و لەماڵ و شاری خۆتاندا گەمارۆتان بدەن و هەوڵی کوشتنتان بدەن، ئیتر دوژمن لەئێوە دەترسیّ نەك ئێوە لەوان بترسن.

ئینجا لەلاپەڕە(١٠٤)دا ڕەخنە دەگریّ لەفەرموودەی(بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێردایە) و پێی پەسەند نییە!....بەڵیّ بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێردایە کاتێك دەسەلاتدارانی بیّ باوەڕو زۆردارانی سەر هەژارو بیّ کەسان بەقسەی خۆش فامناکەنەوەو دادپەروەر نابن و

دەبنە بەربەست لەبەردەم پەیامی ئیسلام کە دادپەروەریی بیری ئەوان و داروەدەستەکانیان دەخاتەوە.

رەخنەیەکی تر دەگرێ کە پەیامبەر (صلى الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((ئاواتی گەیشتن بەدوژمن مەخوازنو ڕەتیدەکاتەوە جیهادکردن عیبادەت بێ، ئەگەر عیبادەت بێ چۆن داوا ئەکات ئاواتی پێ مەخوازن؟

بەڵێ جیهادکردن عیبادەتە، ماڵ و گیانی تێدا بەخت دەکرێ، کە داوامان لێ دەکات ئاواتی پێ نەخوازین، لەبەر ئەوەی سەختیی زۆری تێدایەو موسڵمانان دوور دەخاتەوە لەشەڕ فرۆشتن و هەندێ حاڵەتی تر کە ئەنجامی باش نابێ و مرۆڤ نازانێ لەساتی تاقیکردنەوەدا چۆنە، فێری موسڵمانان دەکات جیهادکردن کۆتا ڕێگە چارەبێ بۆ نەهێشتنی ئەو گرێیەی جیهاد بۆ کردنی پێویست بووە. لەزۆر شوێندا ئۆزۆن ئیسلام بەتالآنچێتیی ناوزەد دەکات لەبەرئەوەی غەنیمەتی بۆ حەلآڵ بووە، لەکاتێکدا ئەگەر ئیسلام بەرانبەر تاك و کۆمەڵگەکان ئەوەی بکردبایە، ئێستا جگە موسڵمان غەیرە موسڵمان لەخاکی موسڵماناندا بوونی نەدەبووە، دیارە تەماشای ئەندەلووسی کردووە کە خاچپەرستەکان بەسەر موسڵمانەکاندا هێنایان، قەتڵوعامییانیان کردو سەروەتەکانیشیان برد، دەیەوێ ئەو عەیبەی ئەوان بەسەر موسڵماناندا ببڕێت.

دەسکەوتی شەڕ بۆ موسڵمانان حەلآڵ بووە، پەیامبەر (صلى الله علیه وسلم) بەسەر جەنگاوەراندا دابەشی کردووە، گرنگترین

شتێکیش لەوەدا شەڕکردن بووە لەپێناو خوا، نییەتی تری تێکەڵ نەبووە، پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ موسڵمانان ڕوونیکردووەتەوە دەبێ هەموو پەرستشەکان بۆ خوا ئەنجام بدرێن، لەشەڕدا لێیان کوژراوە، لەسەرکەوتنیشدا لەو چەك و شتە بەجێماوەی بێباوەڕان بەسەر جەنگاوەراندا دابەش کراوەو ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ هاوەڵان بۆ تاڵانیی شەڕیان کردبێ، چونکە هەندێکیان لەپێناو خوادا ماڵی خۆیانیان بەجێهێشت و بێ باوەڕانی قورەیش ئەوانیان تاڵان کرد، ئەنسارییەکانی مەدینەش ماڵی خۆیانیان خستە خزمەت ئیسلامەوە، کەوابوو ئەم گومانە چەپەڵەت لەکوێوە هێنا ئۆزژن؟ بەچنینەوەی خۆت یان گومانی سەرچاوەی بێ پاڵپشت!

لەلاپەڕە(١١٢)دا فەرموودەیەکی هێناوەتەوە کە پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕێگەی داوە ئەو ژن و منداڵانەش بکوژرێ کە هاوبەش پەیداکەران ئەوانیان کردووەتە قەڵغان و ژن و منداڵی خۆیانن. بەڵام نووسەری بێ ویژدان باسی دوو فەرموودەکەی تر ناکات لە (باب قتل الصبیان في الحرب) و (باب قتل النساء في الحرب) کە پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەهیکردووە ژن و منداڵ لەشەڕدا بکوژرێن و ئەم دوو فەرموودەیەش لەبوخارییدا هەیە و فرمانی پێشوو لەحونەیندا هەڵوەشاوەتەوە.

لەلاپەڕە (١١٣) ڕەخنە دەگرێ لەبابەت ئەو فەرموودەیەی باس لەم ئایەتە دەکات کە پەروەردگار ئەفەرمووێت: ﴿ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِيَ ٱلْفَٰسِقِينَ ۝ ﴾ الحشر: ٥، واتا: ئەوەی بڕیتان لەدار خورما یا لێی گەڕان بەوێستاوی لەسەر بنەکانیان، ئەوە بەفەرمانی خوا بووە وە بۆ سەر شۆڕکردنی لەسنوور دەرچووان بوو.

ڕەخنە دەگرێ لەوەی داری جولەکەکانی بەنو نەزیر بڕێندراوەتەوەو ڕاستیی بابەتەکەی نەخستووەتەڕوو کە پەیامبەر (صلى الله عليه وسلم) لەتەك جولەکەکاندا ڕێکەوتنی هەبووە لەدانی خوێندا هاوبەش بن بەهەڵە دووان لەنەوەی عامر کوژران و پەیامبەریش (صلى الله عليه وسلم) بۆ کۆکردنەوەی خوێنبایی ئەو دوو کوژراوە ڕۆیشتەلای بەنی نەزیر، لەقەراغماڵێکدا سەرقاڵیان کردو ڕۆیشتنە سەرەوە تا لەسەربانەوە بەردێکی گەورەی بەسەردا بدەن و بیکوژن، بۆچوونێکی تریش هەیەو لە (فتح الباري) باسکراوە، کە قورەیشییەکان دوای شەڕی بەدر نامەیان بۆ جولەکەی بەنو نەزیر نارد کە ئێوە خاوەن قەڵای سەخت و بەهێزن و دەبێ ئێوە کوشتنی موحەممەد لەئەستۆ بگرن و هەڕەشەیان لێکردن، بۆیە کۆبوونەوە بۆ غەدر کردن لەپەیامبەر (صلى الله عليه وسلم) و پەیامیان بۆ نارد کە لەگەڵ سێ لەهاوەڵانیدا بچێتەلایان تاوەکو لەتەك سێ زانایاندا گفتوگۆ بکەن، ئەگەر سێ زاناکە باوەڕیان هێنا ئێمەش باوەڕدار

ئەبێن. ئافرەتێکی بەنو نەزیر نامەی بۆ برایەکی ئەنساریی موسڵمانی ناردو هەواڵەکەی پێگەیاند کە نیازی چییان هەیە، هاوەڵەکەش هەواڵەکەی بەپەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) گەیاند پێش ئەوەی بگاتەلای بەنو نەزیر، پەیامبەریش (صلی الله علیه وسلم) نووسراوی بۆیان ناردو هەر ئەو ڕۆژە گەمارۆیانی دا.

پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەواڵی چۆڵکردنی مەدینەی بەعبداللەی کوڕی ئوبەی سەرۆکی دووڕووان بەنەوەی نەزیردا، ئەویش ویستی بەهێزی بەنو نەزیر شکست بەسەر پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) و موسڵماناندا بهێنێ، بۆیە ژێر بەژێر پێیوتن: ناوچەکە چۆڵ مەکەن و ژێر باری فرمان مەبن، موحەممەد زۆر پێداگر نییە لەسەر ئەم فرمانەی، ئەوانیش بەکەللەڕەقی خۆیان و فیتی کوڕی ئوبەیەوە پابەند بوون، بۆیە موسڵمانەکان هەندێ لەدارەکانیان بڕییەوە تا بزانن بڕیاری یەکلاکەرەوەیە، سەرەنجام هاتنەژێر بار.

لەلاپەڕە(١١٥) باس لەبەنو قورەیزە ئەکات لەدوای شەڕی خەندەق پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) هێزی بردووەتە سەریان و جەنگاوەرەکانیانی کوشتووە.

وەلام: ئیسلام میهرو خۆشەویستیی بەخەڵك گەیاندووە، دەستی دڵسۆزی و دۆستایەتی بۆ جولەکەکانی مەدینە درێژ کردو پەیماننامەی لەگەڵیاندا ئەنجامدا و لەدەستووری مەدینەدا مافیانی

سەقامگیر کرد، ئەی ئەوان چییان کرد؟ یەك بەدوای یەك هەوڵی پیلانگێڕی و سەرئێشەیان بۆ پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) و موسوڵمانەکان دروستکرد، بەئاشکرا پەیماننامەیان هەڵنەوەشاندەوەو هانی قورەیشییەکان و عەرەبەکانی دەورووبەر دا لەهەموو لایەکەوە تەنگیان بەموسوڵمانەکان هەڵچنی و خوا موسڵمانانی ڕزگار کرد، ئەگەر مرۆڤ بەویژدانەوە بڕوانێتە شەڕی خەندەق و گەمارۆدانی مەدینە لەلایەن قورەیشییەکان و پاشگەزبوونەوەی جولەکەکانی بەنو قورەیزە بەرانبەریان کە چی پیلانێکیان هەبووە بۆ کوشتنی تەواوی موسوڵمانان و بەکۆیلەکردنی ژن و منداڵیان، بەو ئەنجامە دەگات کە پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕێوشوێنێکی دروستی گرتووەتەبەرو بەفەرمانی خوایی بووە وەك سزایەك بەرانبەر بێ پەیمانیان.

لەفەرموودەی ژمارە(١)ی لاپەڕە(١١٩)باس لەو هەشت کەسە دەکات کە هاتنە مەدینەو موسوڵمان بوون و تووشی نەخۆشیی هاتن و پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ وشتروانەکەیدا ناردنی بۆ دەشت و لەشیرو میزی وشترەکانیان خواردەوەو باش بوون، وشتروانەکەیان کوشت و وشترەکانیشیان برد، پەیامبەریش (صلی الله علیه وسلم) خەڵکی بەدوادا ناردن و فرمانی دا دەست و قاچیان ببڕدرێتەوەو چاویان هەڵکۆڵرێ و لەبەر خۆر فرێدران تا مردن.

زەکەریا ئۆزۆن ڕەخنەدەگرێ کە بۆچی جۆرەکانی تری قیصاصیان بەسەردا جێبەجێ نەکراوە.

وەلاّم: ئەگەر زەکەریا ئۆزۆن بیروانیبایەتە فیقهی ئیسلامی و تەماشایەکی بابەتی دزی و تالاّنکردنی بکردبایە، دەیزانی ئیسلام بۆ پاراستنی سەروەت و ماڵی خەڵك یاسایەکی تۆکمەی داناوە تا خەڵکانێ بوێریی نەکەن دەستدرێژیی بکەنەسەر ماڵی خەڵك.

باس لەجۆرەکانی دزی کراوە ئەگەر یەکجار دزیی کرد چۆنەو دووبارەی کردەوە چۆنە، لەنێو هەموویدا باس لەوە کراوە ئەگەر چەتەیی کردو کەسەکەشی کوشت دەبێ دەست و قاچی ببڕدرێتەوەو هەڵبواسرێ تا ببێتە پەندو کەس بوێریی کاری لەو جۆرە نەکات، ئەگەر چەند کەسێك لەکوشتنی کەسێکدا بەشداربن، سزای بەکۆمەڵ دەدرێن، خۆزگە لەم سەردەمەدا ئەم یاسایەی خوای گەورە جێبەجێ دەکرا و دزی گەورەو بچووك نەدەما و ماڵی خەڵك دەگەڕایەوە دەست خاوەنی.

لەلاپەڕە(١٢٣) فەرموودەیەکی هێناوەتەوەو بەگومانی خۆی و لێکدانەوەی پووچی، ئەنەسی کوڕی مالیك نەیهێشتووە حوکمی خوا بەسەر پوورەکەیدا جێبەجێ بکرێ کە ددانی پێشەوەی جاریەیەکی شکاندووە.

وەلاّم: فەرموودەکەی پێشتر کوشتنەوەی بەقیصاصی بووە، ئەمەی پوورەکەی ئەنەس ددان شکاندنە، نە ئەنەس و نەهیچ

هـاوەڵێكی تـر نـەیتوانیووە حـوكمی خـوا لـەكاربخات چ جـای بەئامادەیی پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ، بـەڵكو سـوێندی تكاكـاریی بـووە[1] و كەسـوكاری جارییەكـەش لەدڵـەوە بەبایی(پارەدان)رازی دەبن، باشـترین بەڵگـەش تكاكـەی ئوسـامەی كـوڕی زەیـدی كـوڕی حاریسـەیە لەبابـەت نەبڕینـەوەی دەسـتی ئـافرەتێكی خـاوەن بنەماڵـە كـە دزیـی كردبـوو، بـەڵام پەیامبـەری خـوا(صلی الله علیه وسلم)بەتكاكردنەكـەی ڕازیـی نـابێ، چـونكە لێبووردنی تێدا نییە.

**فەرموودەیەكی هێناوەتەوە** لەلاپـەڕە(١٢٨)كـە كێشـەی ئـاودێریی كەوتووەتە نێوان پیاوێكی ئەنساریی و عبداللەی كوڕی زوبـەیرەوە، پەیامبـەریش(صلی الله علیه وسلم)فرمـانی داوە عبداللـە ئـاودێریی بكـات و پاشـان ئاوەكـە بـۆ كـابرای ئەنسـاریی بـەر بداتـەوە، ئەنسـارییەكەش وتوویـەتی: لەبەرئـەوەی كـوڕە پوورتـە بۆیـە ئـەم بڕیارە ئەدەی؟

هاتووە ئەمـەی كردووەتـە بیانوویيـەك كـە پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)لەبەرزەوەندیی نزیكەكانیدا بڕیاری داوە.

وەڵام: زانایـان دەڵێـن ئـەو ئەنسـارییە بـە ئەنقەسـت ئـەو قسـەیەی نەوتووە، هەم ئەوان فەزڵی پەیامبەریان زانیوەو هـەم پەیامبـەریش

---

[1] – بڕوانە: فتح الباري، كتاب الديات.

ئەوانی لەدڵدا ئازیز بووە. ئەوەشی کە پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)لەبەرژەوەندیی نزیکەکانیدا بڕیاری دابێ درۆییەکی ڕووتەو زەکەریا ئۆزۆن دەیجوێتەوە، چونکە ئاوەکە سەرەتا بەسەر شوێنەکەی عبداللەدا تێپەڕبووە ئینجا کابرای ئەنساریی، ئەو مرۆڤەشی لەبابەت کشتوکاڵییدا زانیارییەکی سادەشی هەبێ باش ئەوە دەزانێ سەرەتا ئەوەی یەکەم ئاودێریی ئەکات و ئینجا لەوەوە بۆ زەوی کەسی خوارترو بەنۆرەیە.

ئینجا لەلاپەڕە(١٣١)دا پەیامبەر تۆمەتبار ئەکات کە فەزڵی نەوەی هاشمی بەسەر هەموو کەسێکدا داوە. من نازانم مەبەستی بەم فەزڵە چییە؟! کام لەنەوەی هاشمی دەوڵەمەند کرد؟ کێی کردە خزمەتکاری فاتیمەی کچی؟ بەهەشتی بەخشییە ئەو مامەیەی تا مردن بەرگریی لێکرد؟ پاشان دەڵێ: عوسمان وتی: سوێند بەخوا ئەگەر کلیلی بەهەشت بەدەست من بوایە، تەسلیمی هۆزی بەنی ئومەییەم ئەکرد هەتا هەموویان دەچوونە بەهەشت. ئەگەر ئەم قسەیە ڕاست بێ پێشەوا عوسمان کردبێتی، هیچ عەیبەیەکی تێدا نییە مرۆڤ ئاواتبخوازێ کەسوکارەکەی بەختەوەربن، چ جای بەختەوەربوونێك، بەختەوەربوون بەبەهەشت و دەبێ پاڕانەوەو ئاواتی هەر باوەڕدارێك بێ کە خوای گەورە لەگەڵ خۆشەویستانیدا لەبەهەشت کۆیان بکاتەوە، ئەو بەهەشتەی بێباوەڕان و دووڕووان

بۆ دڵۆپە ئاوێكی تكای زەلیلانە لەباوەڕداران ئەكەن، بەلاَم پێیان نادرێ.

**ئینجا لەفەرموودەكەی لاپەڕە(١٣٢)**دا باس ئەو فەرموودەیە ئەكات كە پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)گێڕاویەتییەوە و باس لەوە ئەكات سیحری لێكراوە. ڕەخنە دەگرێ چۆن دەبێ كەسێك وەحی خوایی بۆ بێ و سیحری لێ بكرێ؟

وەلاَم: سیحر كردن لەپەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)و هەر شتێكی تر ڕوویدابێ فرمانیی خوایی وەها بووە ڕوویدات، ئەكرێ نەخۆش بكەوێ، منداڵی بمرێ، خۆشەویستانی لەدەست بدات، دەربەدەر بكرێ، بەبازاڕدا بگەڕێ، نان بخوات، بخەوێ و مومارەسەی ژیانی مرۆیی خۆی بكات، ئەم سیحر لێكردنەشی تەواوەو لوبەید ئەنجامی داوەو ئێمەی موسڵمانیش لەسەربووردەی موحەممەدی ئازیزماندا(صلی الله علیه وسلم)فێر بووین چۆن خۆمان لەكاریگەریی سیحرو جادوو بپارێزین و پەیامبەریش(صلی الله علیه وسلم)فێری ئەو ویردانەی كردووین كە بەپشتیوانیی خوای گەورە سەلامەت ئەمانهێڵێتەوە.

**لەلاپەڕە(١٣٥)**دا باس لەوە ئەكات كە عائیشەی دایكی باوەڕداران(خوای لێ ڕازی بێ) دوو پیرەژنی جولەكەی مەدینە دێنەلای و دەڵێن كاتێ كەسێ دەمرێ و دەخرێتە گۆڕەوە، لەناو

گۆڕدا سز دەدرێت و منیش باوەڕم پێیان نەکرد، دوای ڕۆیشتنیان ئەمەی بۆ پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)گێڕاوەتەوەو پەیامبەریش فەرموویەتی: ڕاستیان وتووەو مردوو لەناو گۆڕدا بەجۆرێك سزا دەدرێ هەرچی گیاندارە سزاو هاوارەکەی دەبیستێ و ئیتر لەوجا بەدواوە پەیامبەری خوام لەنوێژدا بدیبایە پەنای بەخوا دەگرت لەسزای ناو گۆڕ.

وەلأم: خوای گەورە ئەفەرمووێت:﴿يُثَبِّتُ اللهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾، واتا:خوای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەدار ئەکات لەسەر گوفتاری بەجێ و دروستیان لەژیانی دنیادا، لەسەرەمەرگ و لەقیامەتیشدا.

بابەتی پەنا گرتن بەخوا لەسزای ناوگۆڕ لەڕێگەی ئەو دوو پیرەژنەوە نەهاتووەتە ناو ئیسلامەوە، ڕاستخستنەوەی پەیامبەری خواش (صلى الله عليه وسلم)شتێکی لەوە نافامرێت، بابەتێکە پەیوەندیی بەتەواوی موسڵمانانەوە هەیە خۆیان لەسزای سەرەمەرگ و گۆڕو حەشرو دۆزەخ بپارێزن و دایکە عائیشەش دوای ئەوە پەیامبەری خوای(صلى الله عليه وسلم)لەنوێژدا بینی بێ پەنای بەخوا گرتبێ لەسزای ناو گۆڕ تەنیا ڕێکەوتێك بووەو گێڕانەوەی زۆر هەیە کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)سزای ناو گۆڕی بۆ هاوەڵانی باسکردووە، نمونەی دوو گۆڕی دەرەوەی مەدینە کە یەکێکیان لەبەر خۆنەپاراستن لەمیزو ئەوی تریان لەبەر قسە هێنان و بردن سزای ناو گۆڕ دراون، مرۆڤی سەرڕاست لە بەڕاستخستنەوەی

پەیامبەری خوا بۆ قسەی ئەو دوو پیرەژنە جولەکەیە بەڕەوشتێکی جوان لێکدەداتەوە نەك بەلاڕێیدا ببات.

ئینجا لەبابەت وشەی(حرام)کە بەهۆی ئیرەییەوە خێزانەکانی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە دایکانی ئیماندارانن و عائیشە(خوای لێ ڕازی بێ)ئەیگێڕێتەوەو کارێکیان کردووە پەیامبەری خوا لەهەنگوین و حەلواکەی لای حەفسە(خوای لێ ڕازی بێ) نەخوات جارێکیتر، خوای گەورەش داوایان لێ دەکات تەوبە بکەن و لەوەدا جارێکیتر ئازاری پەیامبەری خوا نەدەن (صلی الله علیه وسلم) و وانەیەکیشە بۆ ئەو ئافرەتانەی هەوێیان هەیە، زەکەریا ئۆزۆن هاتووە دەڵێ حەرامکردن کە گرنگترین کارە لەئاین و شەرعدا......لەخاتوو عائیشەو بوخاری پەسەند ناکەین.

ئەمە لێکدانەوەیەکی سەیرە! کە ئەفەرمووێ: (حرمناه)، واتا: پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)مان لەخواردنی هەنگوین و حەلواکە کرد، نەك بەواتای ئەوەی بڕیاری حەرامکردنی دابێ و خواردنی تاوان بێ، بەڵکو بەواتای بێ بەشکردن دێت کە بڕیاردانی شەرعیی نییە، هەرچۆن یەکێك لەئێمە هەندێجار شتێك لەخۆمان دوور دەخەینەوەو دەڵێین لەخۆمی حەرام دەکەم بیخۆم یان لێتی حەرام ئەکەم بیخۆی، دواتر ئەم کارەش کۆتایی دێت بەتەوبەکردن و دوبارە نەکردنەوەی.

لەبەشی(نەسکی)چوارەم کە تایبەتە بەبوخاری و ئایینەکانی دیکە لەلاپەڕە(١٤١)، بێ تێگەیشتن لەڕاڤەی فەرموودەکان و لێکدانەوەی فەرموودەکانی تری تایبەت بەئەهلی کیتاب، کەوتووەتە بوختان کردن و تۆمەتبار کردنی ناڕەوا، ئەم فەرموودەیەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)ی هێناوەتەوە کە دەفەرمووێت: ((أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله. ويقيموا الصلاة ويؤتوا الزكاة فإذا فعلوا ذلك عصموا مني دماؤهم وأموالهم إلا بحق الإسلام وحسابهم على الله تعالى، واتا: فرمانم پێ کراوە شەڕی ئەو خەڵکە بکەم تا شایەتیی ئەدەن جگە الله هیچ خوایەکی دیکەی بەحەق بوونی نییەو موحەممەدیش نێردراوی خوایەو نوێژ بکەن و زەکات بدەن، ئەگەر ئەوەیان کرد، ئەوە خوێن و ماڵ و ناموسیان پارێزراوە تەنیا بەحەقی ئیسلام نەبێ و لێپرسینەوەشیان لەسەر خوایە.

ئەمە فەرموودەیەکی سەحیحی پەیامبەری خوایە(صلی الله علیه وسلم)، بەلام دەبێ ئەوە بزانین ئەم فەرموودەیە تایبەتە بەو کەسانەیە کەوتوونەتە جەنگەوە لەگەڵ ئیسلامدا، نەك ناچار کردنی کەسانی تر، لەم حاڵەتەدا سێ بژاردە هەیە: یان موسڵمان بوون یان جیزیەیەك کە پارەیەکی کەمە یان شەڕ کە خودی دوژمن ئەوەی ویستووە، ئەگەر ئیسلام بەم تێگەیشتنەی زەکەریا ئۆزۆن هەڵسوکەوتی کردبایە، ئەوە ئێستا مەسیحیی و غەیرە موسڵمانەکان

لەنێو گەلانی موسڵماندا بوونیان نەدەبوو[1]. بەڵگەش بۆ ئەوەی فەرموودەکە تایبەت بەو کەسانەیە، ئایەتی ٥ی سورەتی تەوبەیە کە دەفەرموێت:﴿ فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ﴾، واتا: ئەگەر ئەو بێباوەڕانەی وا جەنگی باوەڕداران ئەکەن، ئەگەر تەوبەیان کردو نوێژیان کردو زەکاتیان دا وازیان لێبهێنن.

(أسلموا تسلموا)ش بۆ سەلامەت بوونە لەدۆزەخ و پایەداریی دونیاو ڕێککەوتن بەموسڵمان بوون یان جیزیە.

لەفەرموودەی(٢) لاپەڕە١٤٣رەخنەی لەو فەرموودەیە گرتووە کە پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)مژدەی خوای گەورەی ڕاگەیاندووە:گەر هەر کەس لەئوممەتەکەی هاوبەش بۆ خوا بڕیار نەداو بمرێ دەچێتە بەهەشت، ئەبو زەڕ دەڵێ: ئەگەر کاری داوێن پیسی و دزیشی کردبێ؟ پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)دەفەرمووێ: ئەگەر کاری داوێن پیسی و دزیشی کردبێ. ڕەخنە دەگرێ کە فەرموودە هەیە لەسەر قسەو کردەوە لێپرسینەوەی مرۆڤ دەکرێ و چۆن ئەم موسڵمانە بەئەنجامدانی داوێن پیسیی و دزیشەوە دەچێتە بەهەشت؟

---

[1] - بۆ وەڵامی تۆمەتەکان بڕوانە: تسامح الإسلام وتعصب خصومه، هەروەها الإسلام في قفص الإتهام ی دکتۆر شوقی أبو خلیل کە وەڵامی پوخت و یەکلاکەرەوەن، هەروەها إعتذار لمحمد والقرآن ی جون دیفینبورت.

وەڵام: سەرەتا دەبێ ئەوە ڕوونبکەمەوە، بەئەنقەست بێ یان نەزانی سێ جار وشەی (حیزی)بەکارهێنراوە، ئەم بەکارهێنانە زیاتر بۆ سووکایەتیکردنە بەناوەڕۆکی فەرموودەکە نەك بەکارهێنانی ئاسایی، چونکە لەکوردەواریدا ڕوونە حیزیی بەئەنجامدانێکی بەردەوام و ڕوو ڕەشییەکی زۆری ئەو مرۆڤانە دەوترێت کە بەو کارەوە ناسراون، بەڵام ئەنجامدانی تاوانێکی لەو جۆرە مرۆڤەکە نابێتە هەڵگری وەها وەسفێك و دژیەکییەکیش لەنێوان فەرموودەکاندا نییە، چونکە بەهەشت بەتەوبەو پەشیمانییەوە گرێدراوە.

ئینجا هاوبەش پەیداکردن و تاوانێکی تر جیاوازییان زۆرە، لەهاوبەش پەیداکردندا مافی خوایەتی خوا پەراوێز دەخرێ، بەڵام لەتاوانی تردا بێ فەرمانیی خوای تێدایەو سزای هەردووکیان وەك یەك نییە، زانایان دەڵێن: مرۆڤی موسڵمانی تاوانبار دەچێتە بەهەشت دوای وەرگرتنی سزای تاوانەکانی.

لەلاپەڕە(١٤٤) ڕەخنە دەگرێ کە((موسڵمان نەبێت، کەس ناچێتە بەهەشت. بەڕاستیی ئەم مرۆڤانە سەیرن! دژایەتیی خواو پەیامبەرەکەی ئەکەن و دانی خێری پێدا نانێن و هەواوو ئارەزووەکانیان زیز ناکەن و کەچی بەگللەیین بۆ شوێنێکیان لەبەهەشت پێ نادرێت، لەکاتێکدا شوێنێکیان لەدڵدا بۆ خواناسیی جێ نەکردووەتەوە! هەر ئەم قسەیەیان پێچەوانەو دژە

بەفەرموودەکەی خوارتر کە لەفەرموودەیەکی درێژدا پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، ئومێد ئەکەم ئێوە نیوەی ئەهلی بەهەشت بن، تەنیا مرۆڤی ملکەچبوو بەفەرمانی خوا دەچێتە بەهەشتەوە...... ئەگەر بڕوانینە ئەم فەرموودەیە بۆمان ڕووندەبێتەوە کە ئومێدی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)ئەوەیە موسڵمانەکان(ئوممەتەکەی)نیوەی ئەهلی بەهەشت بن، ئەی نیوەکەی تری؟ بۆ پەیامبەران و پیاوچاك و خواناسانی پێش ئیسلامەو لەمەدا ئاشکرا دەردەکەوێ ئیسلام باوەڕدارانی تری سەردەمانی پێش ئیسلامی نەکردووەتە دەرەوەی بەهەشت، بەڵکو بووەتە ویردی سەر زومانی موسڵمانان:کە خوایە گیان لەگەڵ پەیامبەران و چاکەکاران و شەهیدان و ڕاستگۆیاندا حەشرمان بکەی، ئەمەیە تکای موسڵمانان نەك توانجە نابەجێکەی ئۆزۆن.

ئینجا لەباسی هەڵگەڕانەوەدا((من بدل دینه فاقتلوه، هەرکەس دینی خۆی گۆڕی بیکوژن، لێکدانەوەیەکی هەڵەی کردووەو پێی وایە هەر کەسێکیش لەجولەکەو گاورەکان کە دەبووە موسڵمان دەبوو بکوژرایە.

نەخێر فەرموودەکە ئەم مەبەستەی نییە کە ئۆزۆن بۆی چووە، بەڵکو ئایینی قبوڵکراو لای خوای گەورە ئیسلامەو فەرموودەکە ڕوون

باس لەو کەسانە دەکات کە لەئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە، واتا: من بدل دینە فاقتلوه، أي دینە الإسلام[1].

لەلاپەڕە(١٥٢) فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەی هێناوەتەوە کە پەیامبەر(صلی اللە علیه وسلم) لەبارەی عەمری کوڕی عامری کوڕی لوحەی خوزاعییەوە ئەفەرمووێت:لەئاگری دۆزەخدا بینیم ڕیخۆڵەی بەئاگردا کێش دەکرد، ئەو بوو یەکەم کەس ئاژەڵی بەرەلاکردنی داهێنا.

نووسەر هاتووە ڕەخنە دەگرێ کە بۆچی ئەم سزایەی بەسەردا بدرێ لەکاتێکدا خاوەن قەدرو ناوبانگیی بووە.

زەکەریا ئۆزۆن بەدەردی ڕەتکردنەوە تووشهاتووە، دەنا دەبێ بزانێ ڕاستە عەمر پیاوێکی بەناوبانگی خوزاعە و سەرپەرشتیاری کەعبە بووە لەپێش قورەیش، بەڵام ئەو بوو لەشامەوە بتەکانی هێنایە پاڵ کەعبەو مۆدێلی بتپەرستیی هێنایە نێو عەرەبەوە، هۆی سەرەکیی سزای دۆزەخیشی هەر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، بیڕوانییایەتە فەرموودەی دیکەی سەبارەت بەعەمری کوڕی عامر ئەم بۆچوونەی بۆ ڕووندەبوویەوە کە خودی ئەبو هورەیرە لەگێڕانەوەیەکی تردا ئەفەرمووێ:((وذلك لأنَّه أوَّل من غَيَّر دينَ إسْمَاعيل، واتا:چونکە یەکەمین کەس بوو ئاینی ئیسماعیلی گۆڕی ،

[1] – هەڵگەڕانەوە لەئیسلام لەکتێبە فیقهییەکاندا باس و خواسی لەسەر کراوەو کاری تاك بەتاك نییە حوکمەکە جێبەجێ بکات.

دیاره ئەوەشی بینیووە، بەڵام ئەوەی نەنووسیوەتەوە تا خوێنەر بەلاڕێدا ببات وەك ئەوەی نووسەرە داخ لەدڵەکانی تری بەرانبەر ئیسلام دەیکەن.

لەبەشی(نەسکی)پێنجەم لاپەڕە(١٥٧)دا باس لەبوخاری و فەرمانڕەوایەتی هاوەڵان ئەکات و دەڵێ:هاوەڵان فریشتە نەبوون، ئەوانیش وەك خەڵکی دی خۆشەویستی و ڕق و کینە و هاوڕایی و جیاوازی و هەندێ شتی دیکە لەنێویاندا ڕوویداوە.
وەڵام: زۆربەی ئەوانەی ئەمە دەڵێن نیازیان نییە بەباشی باسی هاوەڵان بکەن، بەڵکو دەیانەوێ لەپاڵ ئەم قسەیانەوە گومان بخەنەسەر سیستەمی فەرمانڕەوایەتیی ئیسلام و هەوڵێك بۆ جیاکردنەوەی ئایین لەدەوڵەت، لەکاتێکدا هەڵەی زەقیان ئەوەیە دەرك ناکەن و ناڕوانن دانانی دەستوور ئیشی کێیە، ئەگەر ئیسلام دین و دەوڵەت نەبێ بۆ دەستووری مەدینە نووسرایەوە؟ حوکمەکانی ئیسلام کێ ڕایدەپەڕێنێ؟ پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) کە ڕۆیشتە مەدینە، بۆچی ئەوس و خەزرەج دەستیان هەڵگرت لەتاجدارکردنی عبداللەی کوڕی ئوبەی بەپادشای مەدینەو هەموو لەدەور پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)کۆبوونەوەو بڕیاری تەشریعیی و سەربازیی و کۆمەڵایەتی و ....هتد لەدەستی پەیامبەردا کۆبوویەوە؟

ئینجا ڕەخنە دەگرێ بۆچی دەسەلآت و فەرمانڕەوایی لەدەست قورەیشدا کۆبێتەوە؟ ڕەنگە ئەمە نەیڕوانیبێتە مەزهەبە سوونیەکان و ڕایانی لەو بارەیەوە تەماشا نەکردبێ! قورەیشییەکان کە مەبەستمان موسڵمانەکانیانە، لەوانی تر باشتر ئاشنایەتییان بەژیان و حوکمەکانی ئیسلام هەبوو، خۆ بۆ هەموو قورەیشییەك نەبوو ببێتە جێنشین، بەڵکو بەمەرج و توانای بەڕێوەبردن بوو، خەڵکانی تری موسڵمانیش بەشداری بەڕێوەبردن کران لەنێو پانتایی دەوڵەتی موسڵمانان و ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان و عەلیی بوون لەدوای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)ئیسلامیان لەمێژوودا تۆمارکردو پێگەیان بەهێز کردەوە، سەرباری هەندێ ئاژاوەی کۆتایی.

ئینجا فەرموودەی(٤)ی لاپەڕە(١٦٣)وەلامی خۆیەتی کە بۆ لێکدانەوەی فەرموودەی(٣)کردوویەتی و ڕەخنە دەگرێ گوێڕایەڵیکردنی پەیامبەری خوا گوێڕایەڵیکردنی خوایەو سەرپێچیکردنی پەیامبەر سەرپێچیکردنی خوایەو گوێڕایەڵیکردنی ئەمیری پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)گوێڕایەڵیکردنی پەیامبەری خوایەو سەرپێچیکردنی ئەمیریشی سەرپێچیکردنی ئەوە.
لەفەرموودەی چواردا بەڕوونی ئاماژەی داوە ئەگەر فرمانەکە سەرپێچیی فرمانی خوای گەورە نەبوو ئەوجا گوێڕایەڵیی ئەمیر ئەکرێ. ئاخۆ ئۆزۆن شتێکی هەیە بۆ ئەمە، بەرپرس فرمان

بەژێردەستەکانی ئەکات، فرمانەکەش خراپ نییە، بۆیە دەبێ سەربازەکە بەجێیبهێنێ، ئەمەش لەخۆیدا ڕاهێنانی مرۆڤی موسڵمانە تا بەڕێکو پێکی کارەکانی بەجێبهێنێ و مەرکەزییەت لەکاردا هەبێ.

تاوەکو خراپەیەکی ئاشکراو کوفرو بێباوەڕیی لەدەسەلاتداری موسڵمان نەبینرا ناکرێ بەرانبەری پێ بگیردرێ، هەڕەشەکانیش لەو بارەیەوە بۆ ئەوەیە لەسەر دەنگۆیەکی بێ سەرچاوەو قسەی سەر زارەکی و درۆی خراپەکارو ئاژاوەچی و لێ نەکۆڵینەوەی نەزانانەوە هەنگاوی خراپ نەنرێت. لەئەنجامی وریایی نەکردن لەم بابەتەدا زۆر جار ڕووداوی نەخوازراو ڕوویداوە.

لەلاپەڕە(١٦٥) ئەم فەرموودەیەی هێناوەتەوە: «إِنَّهَا سَتَكُونُ أَثَرَةٌ وَأُمُورٌ تُنْكِرُونَهَا» ، قَالُوا: فَمَا يَصْنَعُ مَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ هُنَا يَا رِسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «أَدُّوا الْحَقَّ الَّذِي عَلَيْكُمْ، وَاسْأَلُوا اللَّهَ الَّذِي لَكُمْ» کە ئەگەر فەرمانڕەواکانتان خراپ بوون ئێوە مافیان بدەن و داوای مافی خۆشتان لەخوا بکەن. ئەمە بۆ ئەوە نییە گەورەی موسڵمانان ببنە بخۆری ژیانی خەڵکەکە، نەخێر ئیسلام پێشتر باسی فەرمانڕەوایی و مەترسییەکانی قیامەتی کردووە، ڕەنگە مرۆڤ بەکاری فەرمانڕەوایەکی موسڵمان قایلْ نەبێ، ئەو فەرمانڕەوایانەی حوکمی خوایان بەجێهێناوەو لەهەندێ شتدا کەمتەرخ بوون نەك لەبێباوەڕیی و خراپکردنی کۆمەڵگە، لەم کاتەدا فرمان دراوە موسڵمانان

لەچاکەدا بەشداری بن و لەخواش بپاڕێنەوە چاکی بکات یان بەکەسێکی چاکتر بیگۆڕێتەوە، چونکە بەو ئارامگرتنە خۆی لەخوێنڕێژییەکی گەورە پاراستووە کە نازانرێ ئەنجامەکەی چۆن ئەبێ(بڕوانە: فتح الباري).

ئەوانەی دواتر لەفەزڵی مەککەو مەدینەدا هاتوون هەموو فەرموودەی ڕاستن، ڕووداني هەر ڕووداوێکی مێژوویی وەك مێژووی موسڵمانانی وەردەگرین نەك عەقیدەو شەریعەتی ئیسلام و باسی دەستدرێژیکردنەسەر هەزار کچی مەدینەش درۆیەکی زەق و بوختانێکی گەورەی مێژوونووسان و گێڕەرەوانی شیعەیە کە لەدوو لاوە ژەهری خۆیانیان ڕشتووە، لەلایەکەوە بۆ ناشیرینکردنی ئەمەوییەکان و لەلایەکی ترەوە بۆ شکاندنی ناوبانگیی خەڵکی مەدینەی میواندۆست و دڵسۆز بۆ ئیسلام و ئەبێ ئەسیر لەتەبەرییەوە وەریگرتووە، تەبەریش لەئەبی موخنەفەوەو زەکەریا ئۆزۆن بەوشەی دەڵێن ئەو تۆمەتی دەستدرێژییکردنە ئەگێڕێتەوە !بێ ئەوەی ئەوە ڕوونبکاتەوە کە گێڕانەوەکانی تری جگە ئەبو موخنەف درۆی لەم شێوەیەیان نەگێڕاوەتەوە.

هیچ یەك لەفەرموودەکانی بوخاریی ڕەنگی خێلآیەتی و هۆزگەریی تێدا نییە تا مرۆڤێکی نەخۆشی وەك زەکەریا ئۆزۆن بەو جۆرە ناوزەدی بکات. ئۆزۆن هەر لەسەرەتاوە سەرتاپای فەرموودەی ڕەتکردووەتەوەو پیرۆزیی و ڕەوایەتیی بۆ تەشریعی لێ دوورخستووەتەوە بەگومانی خۆی، لەنێو ئەو هەزاران فەرموودەی

سەحیحی بوخارییدا ئەمانەی دەستهەڵچن كردووە! كەلای زانایان بۆچوونەكانی هیچ بایەخێكی نییە، تۆ بڵێی زانایان قسەو ڕاڤەیان بۆ نەكردبیّ! بەڵام دەردی زەكەریا ئۆزۆن لەوە گەورەترە، مێژووی موسڵمانان كە مێژووی مرۆڤە تێكەڵ بەعەقیدەو فەرموودە كردووە، جا هەركەسیّ تاوان و لادانێكی كردبیّ بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە فەرموودەكە بەوان نەگەیشتبیّ، نەخێر ئەوە مێژووەو لەو مێژووەشدا زۆرێك درۆو بوختان هەیەو مێژوونووسانیش سەرچاوەی درۆو بوختانەكانیان نووسیوەتەوەو لەكتێبەكانی پیاو ناسی(علم الرجال)و جەرحو تەعدیلدا شتی زۆر نایاب هەیە تاوەكو زەكەریا ئۆزۆن شتێكی بۆ ڕوونبێتەوە. كتێبەكانی دكتۆر موحەممەد عەلی سەلابییش ڕەتدانەوەی باشی تێدایە بەرانبەر بەو درۆو قسە بیّ سەرچاوانەی بەناهەق بەمل موسڵمانانەوە خراوە.

لەلاپەڕە(١٧٢) باس لەهاوەڵانەو ڕەخنە دەگریّ كە شوێنكەوتەو زانا بەڕێزەكان زیادەڕۆییان لەپلەو پایەی هاوەڵان كردووە و وەك فریشتە سەیری هاوەڵانیان كردووە، لەكاتێكدا چاكەكارو خراپەكارو ڕەزیل و ترسنۆك و نەزان و هتد تیادا بووە.
وەڵام: ئەمە دەربڕینێكی بیّ ڕێزیانەیە بەرانبەر بەهاوەڵان، بەتایبەت لەوشەی خراپەكاردا كە دەكاتە(مفسد)ی عەرەبی، زەكەریا ئۆزۆن نمونەی ئەحمەد سوبحیی مەنسور كە ماڵەكانیان لەماڵی موسڵمان ناچیّ و ئەخلاقی ئیسلامی و ئینسانییان نییە،

دەیانەوێ لەپاڵ تانەدان لەهاوەڵان فەرموودەکانی پەیامبەر (صلی الله علیە وسلم)لەکەدار بکەن و بیانوویەك بۆ بێ ڕێزیی خۆیان بدۆزنەوە، دەنا مرۆڤی موسڵمان و بەویژدان وەها وەسفیکی هاوەڵان ناکات، ئەگەر خراپەکار بوونایە ئیسلام بەئێمە نەدەگەیشت و لوتکەی ئەخلاق بەرزییان لەشارستانییەتدا تۆمار نەدەکرد، ئەگەر ترسنۆك بوونایە ئیسلام لەسنووری مەدینە تێنەدەپەڕی و بەشوێنانی تر نەدەگەیشت، ئەگەر ڕەزیل بوونایە بەسەروەتی خۆیان تفاقی جەنگییان ئامادە نەدەکرد، لەئاست پایەداریی ئەواندا پێویستمان بەهێنانەوەی بەڵگەی ئایەت و فەرموودە نییە کە زۆرێك دەق هەیەو پایەدارێتی و خۆشەویستیی ئەوانمان بۆ دەردەخات، چونکە زەکەریا ئۆزۆن لەوە کەمترە لەباوەڕو وەحی خوایی بکات.

لەفەرموودی(١)دا:" عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَايَعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلى الله عَلَيه وَسَلم عَلَى الإِسْلاَمِ، فَأَصَابَ الأَعْرَابِيَّ وَعْكٌ بِالْمَدِينَةِ، فَأَتَى النبي صَلى الله عَلَيه وَسَلم، فَقَالَ: يَا محمد أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى رَسُولُ اللَّهِ صَلى الله عَلَيه وَسَلم، ثُمَّ جَاءَهُ، فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى، ثُمَّ جَاءَهُ، فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى، قال: فَخَرَجَ الأَعْرَابِيُّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلى الله عَلَيه وَسَلم: إِنَّمَا الْمَدِينَةُ كَالْكِيرِ تَنْفِي خَبَثَهَا وَيَنْصَعُ طِيبُهَا." باس لەو پیاوە ئەعرابییە ئەکات کە هاتە مەدینەو بەیعەتی بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)داو دواتر نەخۆشکەوت و داوای کرد پەیامبەری خوا(صلی الله علیە

وسلم)بەیعەتەکەی پێ بداتەوە، بەلاَم پەیامبەر(صلی الله علیە وسلم)بەیعەتەکەی هەڵنەوەشاندەوەو مەدینەی بەجێهێشت، پەیامبەر(صلی الله علیە وسلم)فەرمووی: مەدینە وەك كوورە وایە، پیسییەکەی فڕێ دەدات و پوختەکەی ئەهێڵێتەوە.

**زەکەریا ئۆزۆن** هاتووە لەبارەی ئەم فەرموودەیەو فەرموودەی تری تایبەت بەگەورەیی مەدینە دەڵێ: ئەم فەرموودەیە وەك گەیشتووە بەپێشەوا بوخاری بەخەلیفەی چوارەم عەلی کوڕی ئەبی تالیب نەگەیشتووە کە مەدینەی بەجێهێشت!
وەلاَم: ئەم بەراوردکردنە زۆر نەزانانەیە، چونکە ئەعرابییەکە مەدینەی بەجێهێشت بەرقبوونەوە لەو شارەو وەهای دانا مەدینەو موسڵمانبوونەکەی بووەتە هۆکاری ئەو نەخۆشییەی، بەلاَم دەرچوونی پێشەوا عەلی لەمەدینە هۆیەکی تری هەبوو، ویستی ئاژاوە لەمەدینە دووربخاتەوەو دوای هێوربوونەوەی دۆخەکە بۆی بگەڕێتەوە، بەلاَم دۆخەکە هێور نەبوویەوە و سەرەنجام لەلایەن خەواریجەوە شەهید کرا(خوای لێ ڕازی بێ).

**دواتر** دێتەسەر باسی پشتیوانان و فەزڵی پشتیوانانی لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم) و ڕەخنە دەگرێ کە بۆچی لەنێو دە کەسی موژدە پێدراوانی بەهەشتدا یەك کەسیان تێدا نییە. دەبوو بزانێ هەر ئەو دە هاوەڵە بەڕێزە بەهەشتیی نین، کەچی بیری

چووەتەوە و سەربووردەی پەیامبەری لەگەڵیاندا بەرچاو نەکەوتووە، سەیرێکی پەیوەندیی خۆشەویستانەی نێوان پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) و پشتیوانانی بکردبایە وەڵامی ئەو پرسیارە گەوجانەی خۆی وەردەگرتــــــەوەو پەیامبــــــەریش ئــــــەوانی لەدەســــــەڵات دوورنەخستووەتەوە، هەڵبژاردنی خەلیفە لەباشترین و شیاوترینەوە بووە کە لەبناغەوە لەگەڵیدا بوون و هاودەنگیی هەموولایەکی لەسەر بووە، هەرچی وترابێ لەنێوان هەردوولایاندا تەنیا بۆ ڕوونکردنەوەی دۆخەکــە بــووە نــەك ئــەوەی سەرچــاوە بــێ بنــەماکان ئــەیڵێن، موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)یش تا کۆتا هەناسەی ژیانی لـەنێو ئەوان دەرنەچوو، ئەمە دوای فەتحی مەککەش.

لەفەرموودەی(٤)دا هۆیـەکی دۆزیوەتـەوە بـۆ تانـەدان لەپەیوەنـدی نێـوان عائیشـەی دایکـی ئیمانـداران و عـەلی کـوڕی ئـەبو تاڵیـب(خوا لەهەردووکیان ڕازی بـێ)، کـە دایکـە عائیشـە گێڕاویەتییـەوە کاتێـك پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)نەخۆشییەکەی قورس هاتەوە، داوای لەهاوسەرەکانی کرد مۆڵـەت بـدەن لـەماڵی منـدا بمێنێتـەوە و ئەوانیش بەداواکەی ڕازی بوون، دوو کـەس چـوونەتە ژێـر بـاڵی کـە عــەباس و پیــاوێکی تــر بــووەو عوبەیــدوڵڵا بــۆ عــەباس ئەمــەی گێڕاوەتەوە، عەباس وتوویـەتی: نـەیووت پیاوەکـەی تـر کـێ بـووە، دەڵێ: نە. عەباس دەڵێ: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بووە.

وەلآم: سـەرەتا لەوەرگێڕانەکـەدا هـاتووە: مۆڵـەتی لەخێزانـەکانی وەرگرت لەماڵی مندا بکەویٚ. وشەی(کەوتن)جوان نییە، جوان نییەو نەمانبیستووە کەسێکی بەڕێز بڵێ:باوکم یان کەسـەکەم لـەماڵ منـدا بکـەویٚ! ئەمـە قسـەی دایکـە عائیشـە نـەبووە، بـەڵکو دەڵـێ: لـەو نەخۆشییەیدا مۆڵەتی لەخێزانەکانی خواست لەماڵی مندا بمێنێتەوە.
ئینجا لـەم فەرموودەیـەدا حـوکمێکی شـەرعیی وەردەگرین ئـەویش ئەوەیـە: پیاوێـک زیـاد لـەژنێکی هـەبێ دەبـێ بەیەکسـانیی لایـان بمێنێتـەوە، تەنانـەت لەنەخۆشکەوتنیشـدا مۆڵـەت و ڕەزامەنـدیی خێزانەکـەی تـری لەسـەربێ، ناونـەهێنانی عـەلیش کاریگـەریی ناخاتەسەر حوکمەکە، ڕەنگە کاریگەریی ئەو قسەیەی لەسەر بێ کە لەو ڕووداوە ناخۆشەی تۆمەتی خراپ بۆ دایکی ئیمانداران هەڵبەسترا و پێشەوا عەلی بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ی وتبێ: ئـافرەتی تـر زۆرە جـۆرە گللەییـەکی لەدڵـدا دروسـتکردبێ. هـەر ئـافرەتێکی تریش بێ ئەم قسەیەی پێ ناخۆشە کە بەزیان بۆ ئـەو دەگەڕێتـەوە، سەرباری ئەوەی دواتر خوای گەورە ئەستۆ پاکیی و گەورەیی دایکی ئیماندارانی سەلماند بەرانبەر ئەو تۆمەتەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبـەی گەورەی کردەوەو کاریگەرییەکی دەروونیی گەورەی خستەسەر دڵـی عائیشەی دایکی باوەڕداران. سـەبارەت بەشـەڕی جەمـەلیش، ئـەوە لەلایـەن سەرچـاوە باوەڕپێکراوەکانـەوە سـەلماوە، دایکـە عائیشـە لەگەڵ هاوەڵانی تردا بۆ ئاشتەواییکردنی نێوان موسڵمانان دەرچوون

و بەپیلانی خەواریج و دووڕووەکان شەڕەکان ڕوویانداوەو لێرەشدا بوار نییە تەواوی تۆمەتەکان ڕەتبکرێتەوە[1].

**ئینجا لەلێکدانەوەی لاپەڕە(١٨٥)دا لەبابەت بەشە میراتی** پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)کە بۆ سەدەقە دانرابوو لەدەسکەوتەکەی بەنونەزیرو عەلی و عەباس دەچنەلای پێشەوا عومەر(خوا لەهەموویان ڕازی بێ)کە کامیان سەرپەرشتیی بکات، زەکەریا ئۆزۆن عومەر تاوانبار ئەکات بەوەی لەفەرموودەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)و خەلیفەی یەکەم لادەدات. ئەمە تۆمەتێکی گەورەیە، **چونکە لەلاپەڕەی(١٨٤)دا** وەلامی ئەم درۆیەی خۆی ئەداتەوە کە ئەمەی هێناوەتەوەو پێشەوا عومەر وتوویەتی: تەسلیمم کردن بەو مەرجەی: (بەڵێن و پەیمانی خودا بێت کە وەك پێغەمبەر(د.خ)و ئەبو بەکرو ئەو دوو ساڵەی من چۆن بووە)هەر ئەم قسەیەی پێشەوا عومەر دەریدەخات لەبڕیاری پەیامبەرو ئەبو بەکر دەرنەچووە.

**لەفەرموودەی(٦)لاپەڕە(١٨٥)دا:** «اهْجُهُمْ- أَوْ هَاجِهِمْ- وَجِبْرِيلُ مَعَكَ»، ڕەخنە دەگرێ کە ئەمە لەگەڵ ڕەوشتبەرزیی

---

[1] - بڕوانە:مێژووی خەلیفە ڕاشیدییەکان، گومان و وەلامدانەوەکان:نووسینی:د. عبدالمجید محمد الرفاعي. وەرگێڕانی: عبدالله گەرمیانی.

موحەممەد(صلی اللە علیە وسلم)یە نایەتەوە، وەهای داناوە هەجو تەنیا شەڕە جنێو و قسە وتن بێ بەناموسی یەکتر. بەڵکو شەڕە شیعر بووە لەنێوان حەسسان و جولەکەدا، ئەوان ڕقیان لەجیبریل(علیە السلام)بوو، بۆیە پەیامبەر(صلی اللە علیە وسلم) جیبریلیشی ناو هێناوە. حەسسان دەڵێ:

وجبريل رِسول الله فينا ... وَرُوحُ الْقُدُسِ لَيْسَ بِهِ خَفَاءُ

ئینجا تانە دەدات کە حەسسانیش بەتۆمەت هەڵبەستن بۆ عائیشەی دایکی ئیمانداران تێوە گلاوە، کەچی عائیشە لەو خۆشبووەو ڕقی لەعەلی بووە.

ئەمە تۆمەتە: حەسسان تەوبەی کردو بەشیعر داوای لێبووردن و گەورەیی دایکە عائیشەی باسکرد، رقایەتییش لەنێوان عائیشەو عەلیشدا نەبووە، هەردووکیان فەزڵی یەکتریان زانیووەو یەك بنەماڵە بوونە، عائیشە خێزانی پەیامبەرو دایکی ئیماندارانە و عەلیش ئامۆزاو زاوای پەیامبەری خوا بووەو لەکۆتایی شەڕی جەمەلیشدا بەوپەڕی ڕێزەوە عەلی دایکە عائیشەی ڕەوانەی مەدینە کردووەتەوە.

ئینجا لەبارەی ئەبو هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێ کە فەرموویەتی: من بۆیە فەرموودەی زۆرم لایە، چونکە من هەمیشە لەگەڵ پەیامبەری خوادا بوومەو هاوەڵانیش سەرقاڵی ئیش و کار بوونە.

بۆ ئەمە زەکەریا ئۆزۆن هاتووە و دەڵێ: خەمی موهاجیر و ئەنسارەکان کۆکردنەوەی ماڵ و سامان و بەرژەوەندیی دونیایی بووە)لا١٨٩.

ئەم قسەو لێکدانەوەیە زۆر نەفامانەیە، ئیسلام کارکردنی بەدونیا ویستیی لێك نەداوەتەوە، بەڵکو کارکردن بەشێکە لەخواپەرستیی و بەشێکی پێکهاتەی موسڵمانانیش کۆچەرییەکان بوونە، وەك پێشەوا عومەر دەیگێڕێتەوەو لە(فتح الباري)شدا هاتووە: کە خۆی و پیاوێکی ئەنساریی ڕێککەوتبوون ڕۆژێك یەکێکیان بۆ ئیش بڕوات و ئەوی تریان بچێتەلای پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)و فەرموودەی لێ وەربگرێ، ئێوارەش دەچوونەلای یەکتر و فەرموودەی ئەو ڕۆژەمان وەردەگرت.

ئەبو هورەیرەش(خوای لێ ڕازی بێ)وەك هەر مرۆڤێکی تر ئازاد بووە ئیش بکات یان لای پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)بمێنێتەوەو خزمەت بکات، لەمەشدا نە ڕەخنەیەك بوونی هەیە دژ بەهاوەڵان بۆ خەریکی ئیش و کار بوونەو نە ئەبو هورەیرەش.

لەلاپەڕە(١٩٢)دا قسەیەکی ناڕەوای وتووە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)بەهاوەڵانی فەرموویەتی و لەڕۆژی دواییدا سەبارەت بەوان پێیدەوترێ: (تۆ نازانیت دوای تۆ چییان هێنایە ئاراوە)بەحەقەت بێ ویژدانییەکی گەورە لەزەکەریا ئۆزۆندا هەیە، پەیامبەری (صلی الله علیه وسلم)مەبەستی هاوەڵانی نەبووە،

مەبەستی ئوممەتەکەیەتی لەدوای خۆی کە لەحەوزی کەوسەردا دادەبڕدرێن و دەخرێنە دۆزەخەوە، پەیامبەریش(صلی الله علیە وسلم) بەشوێنەواری دەستنوێژییانەوە دەیانناسێتەوە کە لەئوممەتەکەین و دەفەرمووێ: ئەوانە ئوممەتی منن، لەوەڵامدا پێی ئوترێت:(تۆ نازانیت دوای تۆ چییان هێنایە ئاراوە).

بەلای زانایان و مرۆڤی عاقڵیشەوە ڕوون دەردەکەوێ کە کام لەکاری هاوەڵان دەقی قورئان و فەرموودەی لەسەرە و کامیش ئیجتیهادە، بەڵام لای نمونەکانی زەکەریا ئۆزۆن کە دەیانەوێ هەموو شتێکی ئیسلام ڕەتبکەنەوەو گومان بخەنەسەر عەقیدەکەی، هاتوون مێژووی موسڵمانانیان لەخۆیان و خەڵکییش کردووەتە عەقیدە، ئەمە لەکاتێکدا بەنیوەش پەیڕەوی شەریعەت و ئەخلاقییاتی ئیسلام ناکەن!

ئینجا ئیبن عەباس ئەگەر سێیەمین ئامۆژگاریی پەیامبەر(صلی الله علیە وسلم)ی بیرچووبێ، ئەوە هاوەڵانی تر هەن ڕووداوەکانی کۆچی پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)یان گێڕاوەتەوەو وەسێت و ئامۆژگارییەکانی بەموتەواتیر هاتوون و لای ئەو برچووبێتەوە هاوەڵی تر گەیاندوویەتی، کە لەو ڕۆژانەدا وەسێتی کردووە لەگەڵ ئافرەتان باش بن و مافیان بدەن، نەفرەتی خوا لەگاورو جولەکەکان بێ گۆڕی پەیامبەرەکانیان کردووەتە مزگەوت.

لەبەشی(نەسکی)شەشەمدا، نووسەر باسی بوخاری و ئافرەت ئەکات، ڕەخنە لەوشەی قەوامە ئەگرێ کە لەقورئاندا هاتووە، بەلآم لەلاپەڕە(١٩٨)دا بۆ پەلاماردانی فەرموودەکانی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم) و کەمکردنەوەیان و تانەدان لەبوخاریی، شەیتانانە هاتووەو دەڵێ: خوای گەورە لەقورئاندا ڕێزی زۆری لێ ناوە(مەبەستی ڕێز نان لەئافرەت)و بەم فێڵە ژەهراوییەی ئەیەوێ گومانی خۆی پەخش بکات، لەکاتێکدا گاڵتەو ڕەخنەی ئەو لەوشەی قەوامەیە کە لەقورئاندا هاتووە.

لەقورئاندا خوای گەورە ئەفەرمووێت:﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ ﴾ النساء: ٣٤، واتا:پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر هاوسەرەکانیانەوە، ئەمەش بەهۆی ڕێزو زیادە ئەرکێکەوە کە خوا داوێتی بەهەندێك بەسەر هەندێکی تردا(سەرەڕای ئەوەی کە(پیاوان لەماڵ و سامانیان خەرج دەکەن(لەپێناوی ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی ئافرەتاندا).

وشەی قەوامە سەرپەرشتیاریی ئەگەیەنێ، کەچی ئەم وشەیە بووەتە دڕکی چاوی خەڵکانێك کە دەیانەوێ ئەزموونی نالەباری کەسانی ترمان بۆ بهێننە ئاراوە بەبێ تەماشاکردنی ئەنجامەکەی.

زۆربەی خوشکان لەم سەرپەرشتیارییە تێدەگەن، تێدەگەن ماڵ و کاروبارەکانی تری ژیان بێ سەرپەرشتیاریی نابێ، ئافرەت کۆڵەکەی ناو ماڵ و پیاویش سەرپەرشتیاری پاراستنێتی، ئەو

خوشکانە باشتر لەم سەرپەرشتیارێتییە تێدەگەن کە مێردەکانیان لەدەست داوە، هەتا مێردەکەی مابوو ماڵ و ژیانی سەلامەت بوو، دوای مردن و کۆچکردنیان مەینەتی و دەستگرتنەسەر ژیان و سەروەتیان هاتووەتە ئاراوە، بەمردنی مێردەکانیان حەقیقەتانە هەستیان کردووە چی قەڵایەکیان لەدەست داوە، ئەمەش منەت نییە، بەڵکو سرووشتی ژیانەو خوای گەورە ژن و مێردی بەپۆشاکی یەکتر و جێی ئارامیی یەکتر دانـاوە، ئەو منداڵە تێدەگات سەرپەرشتیارێتیی چییە کە باوکی لەدەست داوەو بەحەسرەتی باوکێویتی، بەڵام بەداخەوە ئەم سەرپەرشتیاریی و تەواوکردنی ئەرکی یەکتر بەکاری هەندێ نەزان بەژیانی هاوسەرێتیی ناشیرین کراوەو بووەتە بیانووی دەست دڵسۆزانی دۆسییەی ئافرەتان!

پی.دی. جێمز، کە یەکێکە لەبەرجەستەترین و خۆشەویسترین نووسەرانی بریتانیاو بە(شاژنی تاوان)ناسراوەو بەپێشڕەوی ڕۆماننووسەکانی دەقی پۆلیسی دەژمێردرێت[1] لەبارەی کێشەی ژنانەوە کە خوێندنەوەی خۆیەتی بۆ کۆمەڵگەی ئەورووپیی دەڵێ:(ئەگەر ڕاستیت دەوێ...فمینیزم تەنیا ناوێکەو هیچی تر........بەڕای من ئەمڕۆکە هەندێ لەفیمینیستەکان توندڕەون و دژی پیاون، دڵیشیان خۆش نییە بەوەی ژنن، ڕاستیەکەی ئەوەیە بۆ هەندێك کێشەی بنەڕەتی هیچ ڕێگا چارەیەکی ئاسان بوونی نییە،

---

[1] – بڕوانە: خەونی نووسین، وەرگێڕانی لەفارسییەوە: دڵشاد خۆشناو، پێداچوونەوەی: ڕەووف بێگەرد، چ١، ٢٠٠٨دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

ئێمە لەبایۆلۆژییەوە وا دروست بووین کە منداڵمان ببێت و منداڵ زۆر پێویستیان بەئێمە هەیە، بەتایبەتی کاتێ کە بچوکن....سەیر ئەوەیە ئەمڕۆ ژیانی ژنان بە بەراورد لەگەڵ دایکان و داپیرانمان زۆر زەحمەتترە، هەرچەندە یەکسانی ڕەگەزەکان زیاترە. جاران ژنان بنەماڵەی زۆر گەورەو دایەنی زۆر باش و جێگای متمانەیان هەبوو، ئەمڕۆکە ئێمە کۆمەکی وامان نییە.....ئێستاکە لەئەنجامدا ژنان هەم لەلایەن فیزیکی و هەم لەلایەن سۆزدارییەوە لەژێر گوشارن).

ئەمە قسەی ئافرەتێکی نووسەری بەناوبانگی بریتانییە، بەڵام کەسانێکی لای خۆمان هەموو نالەبارییەکی ئەمڕۆی ژیانی کۆمەڵگە دەخەنە ئەستۆی ئیسلامەوە، قسەی فەیلەسوفانمان بۆ دەگێڕنەوەو لەهەندێ ڕووی ترەوە پەردە پۆشی قسەی ئەوانمان بۆ دەکەن و نایخەنە بەر توانج، بۆ نمونە:ئەرستۆ وەهای دەبینێ، ئافرەت بەهۆی سرووشتییەوە شیاوە ملکەچی پیاو بێ وەك چۆن کۆیلە ژێرباری گەورەکەیەتی، چاکەی ئافرەت لەوەدایە ملکەچی مێردەکەی بێ، فەزیلەتی پیاویش لەفرمانکردندایەو بوێریی و هێزی لەپیاو کەمترەو تەنیا بۆماڵداریی شیاوەو دەبێ تەنیا فێری کاری ناو ماڵ بکرێ تا ببێتە دایەنێکی باش[1].

ڕۆسۆش دەڵێ: سەرباری پەروەردە لاشەییەکەی، دەبێ ئافرەت فێری چێشت لێنان و دوورین و میوزیك و گرنگیدان بەمنداڵ بکرێ و

---

[1] – بڕوانە: الدکتور محمود عبدالرزاق شفشق: الأصول الفلسفیة للتربیة، ص٨١، دار البحوث العلمیة١٩٨٢.

کــاری بەســەر زانســتە عەقڵییەکانــەوە نــەبێ. ئــەرکی ئــافرەت بەختــــەوەرکردنی مێردەکــــەی و ڕازیکردنێتــــی و گرنگیــــدان بەپەروەردەکردنی منداڵ[1].

ئەوانەی لەبابەت ئافرەت ڕەخنە لەئیسلام دەگرن زۆر بەقسەی ئەم فەیلەسوفانە کاریگەرن، کەچی هیچ لەمانە ناگێڕنەوە، کارو کردەوەی پیاوێکی موسڵمان کە وەك پێویست لەئیسلام شارەزا نییەو لەژێر گوشاری سەختی سەردەمدا ناڵەی دێ، دەیکەنە بیانوو بۆ تانەدان لەئیسلام، لەبیری خۆیانی ئەبەنەوە لەئیسلامدا ئافرەت گێڕەرەوەی فەرموودەو زانایان تیدا هەڵکەوتووە.

ئەم فەرموودانەی کە زەکەریا ئۆزۆن بۆ تانەدان لەفەرموودەکان هێناویەتییەوە، لەخودی خۆیدا چارەسەری کێشەکانە، بەلام لای ئەو و نەشارەزا بەئیسلام ڕووی حیکمەتی ئیسلام و مەزنیی پەیامبەرەکەی نابینن، ئەگەرچی کەسانێکی موسڵمانیش بەمەدا تێوەگلاون و لەدەردی نەزانیاندا دانایانە هەنگاونانێن و بوونەتە پاساو بۆ خوێندنەوەی ناحەزان.

کێشەیان لەگەڵ مافی سەرپەرشتیارییدا(قەوامە) هەیە، کە پیاو بەهۆی کارکردن و دابین کردنی بژێوییەوە مافی سەرپەرشتیاریی خێزانی پێ دراوە، نەك بەکۆیلەکردنی ژنەکە، لەهەمان کاتیشدا ئافرەت بەهۆی دایکایەتییەوە سێ مافی بەسەر منداڵەکانییەوە هەیە

---

[1] - بڕوانە هەمان سەرچاوە، ل٢٨٢.

ئەوجار باوك مافێكی هەیە، ڕەنگە ئەگەر كێشەی قەوامە نەبووایە كێشەیەكی تریان بسازاندبایە، ئەویش ڕەخنەگرتن دەبوو ئاخۆ بۆ دایك سێ مافی هەیە و باوك مافێك! بەڵام بەخوێندنەوەی دروست ڕووندەبێتەوە كە ناڕەواییەك لەوەدا بوونی نییە.

لەفەرموودەی(۱)لاپەڕە(۱۹۹)دا كە پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ئەفەرمووێت:((إِذَا بَاتَتِ الْمَرْأَةُ مُهَاجِرَةً فِرَاشَ زَوْجِهَا: لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حَتَّى تَرْجِعَ، واتا:ئەگەر ئافرەتێك شەو لەمێردەكەی دووری گرت و سەرجێی لەگەڵدا نەكرد، فریشتان نەفرەتی لێ دەكەن تا لەو ملنەدانەی پاشگەز دەبێتەوە.

رەنگە خوێنەر بپرسێ ئەمە بۆچی؟ لەكاتێكدا دەزانرێ ئافرەت بەلای كەمەوە لەمانگێكدا هەفتەیەك لەسووڕی مانگانەدایە، حەزی پەیوەندیی سەرجێیش لەڕوویەكی شەرعییەوە كە پەیوەندییەكی ژن و مێردانەیە سرووشتی مرۆڤەو عەیبەیەكی تێدا نییە، ئیسلام ڕەچاوی ئەوەی كردووە ئەگەر ژنەكە نەخۆش نەبێ و هۆیەكی نەبێ بۆ ئەو مل نەدانە، فەرموودەكەش هەڕەشەیە بۆ ئەو ئافرەتانەی بەبێ هۆ لەمێردەكانیان دوور

دەگرن، فەرموودەمان هەیە هەڕەشە دەكات لەو پیاوانەی ژنەكانیان ناچاری كاری سەرجێی دەكەن لەكاتێكدا منداڵەكانیان برسییانەو پێویستیان بەشیرپێدانە، هەروەها لەئیسلامدا پەیوەندی سەرجێیكردن تەنیا بەمافی پیاو دانەنراوە، بەڵكو ئافرەتیش لەوەدا

مافی هەیە، مافی ئەوەی هەیە داوای تەلاق بکات ئەگەر پیاوەکەی لەپیاوەتی کەوت یان ئەندامی نێرینەی بڕایەوە، یان گەڕ بوو، بەدەقی ئایەت خوای گەورە لەسورەتی بەقەرەدا لەبارەی ئەو پیاوانەی لەکاری سەرجێی لەئافرەتەکانیان دوور دەگرن چوار مانگ مۆڵەتی پێیان داوە، یان کاری سەرجێیان لەگەڵدا بکەن و دووریان لێ نەگرن یان تەلاقیان بدەن تا بتوانن ژیانێکی تر دابمەزرێنن، ئەگەر هیچ یەك لەو دووانەیان نەکرد، ئەوە دادوەر ئەو کارە ئەنجام ئەدات و ئەفەرمووێت:﴿ لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَاءُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (٢٢٦) وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (٢٢٧)]، واتا:بۆ ئەوانەی کە سوێند دەخۆن نزیکی هاوسەرانیان نەکەون، بۆیان هەیە تا چوار مانگ چاوەڕوانی بکەن(دەبێت لەو ماوەیەدا بڕیاری یەکجاری بدەن)، خۆ ئەگەر ئاشت بوونەوەو ڕێککەوتن، ئەوە خوا لێخۆشبوو میهرەبانە، خۆ ئەگەر سوور بوون لەسەر تەلاق دانیان، ئەوە بەڕاستی خوا بیسەری(بڕیاریانە)و زانایە(بەنیەتیان).

ڕەخنە دەگرێ کە حاڵی ئەو پیاوانە چۆنە کە دەست بەڕووی ژنەکانیانەوە دەنێن کاتێك کاری سەرجێیان بووێ و پیاوەکەش ئەنجامی نەدات. لەکاتێکدا ڕەخنەی بەرانبەر بەوەیە بۆ حەزەکە تەنیا لەدەست پیاو کۆبووەتەوەو جارێکی تریش شتەکەی ئاڵوگۆڕ کردووە، گومان لەوەدا نییە دەستپێشخەریی کارەکە بەزۆریی

لەلایـەن پیاوەوەیـەو دەگمەنـە ئافرەتەکـە ئـەو ویسـتەی هـەبێ و پیاوەکە ئامادەیی نەبێ، کەسانی شارەزاو بەئینسافی بوارەکەش زیاتر لەم ڕاستییە ئەگەن.

ڕەنگە لەڕووی زانستییشـەوە زەکەریا ئۆزۆن بیری نەبووبێ ئەوە ڕوون بکاتەوە کە کاری سەرجێی چەندە پیاو لەکاری هەڵچوون دوور دەخاتەوەو باری جەستەیی و دەروونیی ئارام ئەکاتـەوە و بەدووری دەگرێ لەوەی هەڵچوونە جینسییەکەی لەگەڵ ئافرەتانی تردا بـەتاڵ بکاتـەوەو تووشـی خیانـەت و چـاو لـەدەریی و خراپـەکاریی بـبێ و سەرەنجام جیابوونەوەو بێ نازبوونی منداڵ.

لەفـەرموودە(٢)ی لاپـەڕە(٢٠٠) کـە پەیامبـەر(صـلى الله علیـه وسـلم)ئەفـەرمووێت: ((لَا تَصُوم الْمَرْأَة وبعلها شَاهد إِلَّا بِإِذْنِهِ، واتـا: هەر ئافرەتێك مێردەکەی لەماڵەوە بوو بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی نابێ ڕۆژووی سووننەت بگرێ.

زەکـەریا ئـۆزۆن هـاتووە بـۆ ئـەوە دەگـری بۆچـی نـاهێڵرێ ژن بـەڕۆژووبێ و ئـەو پەرستشـە گەورەیـە بەجێبهێنێ! گریانەکـەی کاریگەرە! ئەم مرۆڤە دووڕووانە بەچەند وێنە خۆ دەگۆڕن، بەڵام با خوێنـەری بـەڕێز ئـەوەی لا ڕوونبێتـەوە، کـە خـوای گـەورە بەنییەتەکان زانایەو پاداشتی ڕازی کردنی دڵـی مێردەکـەی بەرانبـەر بەپاداشتی ڕۆژووەکە داناوە، ژنەکە لەم کاتەدا پاداشتی خوایی بـۆ

هەیە، ئینجا هەمیشە ئەم ڕێ نەدانە دوباە نابێتەوەو بەدەگمەن ئەمە ڕوودەدات. چۆن پیاو بەخەرجکردنی سەروەتی خۆی بۆ ژن و منداڵی خۆیشی پاداشتی بۆ هەیە، بەجێهێنانی مافی یەکتریش پاداشتی بۆ هەیە. باسی ئەو ئافرەتانە ناکەن کە حەزیان بەحیجابەو مێردەکانیان نامێڵن و بوونەتە ڕێگریان لەبەجێهێنانی ئەو فەرزەو ناچارانە سفرەی مەی خواردنەوەیان پێ ئامادە دەکەن، ئای ئەم ئازادخوازانە چەند دووڕووانە مامەڵە ئەکەن!

لەبارەی فەرموودەی: «المرأةُ كالضِّلَعِ، إن أقمتَها كسرتَها، وإن استمتعتَ بها استمتعتَ بها وفيها عِوَج»، واتا: ئافرەت وەك پەراسووە، ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە دەیشکێنی، ئەگەریش لەگەڵیدا بژی بەو خوارییەی پەراسوو دەمێنێتەوە.

ئەگەر ڕواڵەتی فەرموودەکە بەدابڕاویی لەناوەڕۆك و هۆی وتنی بڕوانی، ڕەنگە هەر ئەم تێگەیشتنەی زەکەریا ئۆزۆنت بۆ دروستبێ و وەها بزانی ئیسلام گاڵتەی بەئافرەت کردووە. نەخێر، چۆن ئادەمَ لەخۆڵ دروستکرا، ئافرەتیش لەپەراسووی ئادەم دروست بووە، نە ئادەم لەوەدا ویستی هەبووە نە حەواش، ئەمە ویستی خوا بووە. ڕاستیی بابەتەکە ئەمەیە کە پیاوێك دێتەلای پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)و شکاتی حاڵی ژنەکەی لا دەکات کە بیانووی پێ دەگرێ، پەیامبەریش(صلى الله عليه وسلم)سروشتی ئافرەتی بۆ دەگێڕێتەوە کە سرووشتێکی ناسکی هەیە وەك سرووشتی پەراسوو، پەراسوو چەندە ناسکە ئەمیش ناسکی و نازی تێدایە، پەیامبەر(صلى الله

عليه وسلم)ئەیەوێ پیاوەکەو تەواوی پیاوانی تری موسڵمان نازکێش بن، لەهەندێ نازو وردە کێشەو بۆڵەی ناو ماڵ بەئارامبن، بۆیە ئامۆژگاریی پیاوەکە ئەکات کە ناز کردن و ناسکیی سروشتی ئافرەتەو زۆر لێ مەکە، ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوەو ئەوەی نەهێڵی ناچاری بیشکێنیتەوە، شکاندنەوەشی تەڵاقدان و سووککردنێتی لەنێو خەڵکدا، واتا: دەستهەڵبگرە لەشکاندنەوەی و خۆت ڕابهێنە لەگەڵ هەندێ سروشتیدا کە بە تۆ نامۆیە.

**پاشان فەرموودەی(٣)ی لاپەڕە(٢٠٣)** هەمان ناوەڕۆکی فەرموودەی پێشووتری هەیەو پەیامبەر(صلی الله علیە وسلم)ئامۆژگاریی موسڵمانان ئەکات و دەفەرمووێ:هەرکەسێ باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە با ئازاری هاوسێکەی نەدات، لەگەڵ ئافرەتاندا باش مامەڵە بکەن و ئەوان لەپەراسوو دروستکراون، ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە دەیشکێنی و ئەگەر بتەوێ لەگەڵتدا بمێنێتەوە بەو شێوەیە دەمێنێتەوە، بەچاکە لەگەڵ ئافرەتاندا مامەڵە بکەن.
زەکەریا ئۆزۆن نەهاتووە ئەوە ڕوونبکاتەوە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)چەندە هەوڵی داوە دۆخی ئافرەت چاك بکات و ستەمی لەسەر نەهێڵێ، بەڵکو هاتووە لێی کەمبکاتەوە، پێچەوانەو تانە ئامێز پەلاماری داوە. ئەکرێ ناوەڕۆکی فەرموودەکە بەمجۆرە تێبگەین، کە کێشەیەکی هاوسێیەتی لەئارادا بووە، بەتایبەت زۆربەی کێشەکان شەڕی منداڵن و لەمەشدا بەزۆریی یەخەی دایك

ئەگرێ، بۆیە پەیامبەر(صلی الله علیە وسلم)باوەڕبوونمانی بەخواو ڕۆژی دوایی پەیوەست کردووە بەوەی ئازاری هاوسێ نەدەین کە ئەم ڕێزو گەورەییە ئۆزۆن نەیبینیوە. لەم کێشەیەدا خراپ مامەڵەی ئافرەتێك کراوەو قسەی پێ وتراوە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)ئافرەتەکەی لەم دۆخە ڕزگار کردووەو سەرباری هەر کێشەیەك فرمانی داوە کە دەبێ لەگەڵ ئافرەتاندا باش بن، بەڵام زەکەریا ئۆزۆن هەر دێت و ڕەخنەی لەسەر جۆری دروستبوونەکەی مرۆڤ و شوبهاندنەکەیە، وەك ئەوەی پەراسووی بەلاوە بێ سوود بێ، لەکاتێکدا پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)ئەمەی مەبەست نەبووەو جوان مامەڵەی خێزانەکانی خۆی کردووەو نازکێشیشیان بووە. ژن و پیاویش دەبێ نازکێشی یەك بن و پەیامبەری خواش(صلی الله علیە وسلم)پیاوانی موسڵمانان ڕادەهێنێ کە لەسەر وردە کێشەیەك لەخێزانەکانیان گەورەی نەکەنەوەو کێشەکەیان بچێتە دەرەوەی ماڵ و خەڵکی تر پێی بزانێ، کە سەرەنجام لەگەورەبوونەوەدا بەتەلاق و ناودەرچوون بەزیان بۆ سەر ژنەکە دەشکێتەوە، یان جاری وا هەیە لەسەر شتی بێ سوود خەڵك بەکێشەکە بزانێ و وەك تانە بەناو چاویاندا بدرێتەوە، لەکاتێکدا پەیوەندیی دوای ئەوەیان خۆشەویستانەتریشە، دۆخی تەلاقی ئەمرۆش کە لەهەڵکشاندایە لەئەنجامی ئەم پەیڕەونەکردنەی فەرموودەکانی پەیامبەری ئازیزە(صلی الله علیە وسلم)، ئەگەر وەك پێویست بەئیسلامەتیمانەوە پابەند بوونایە بازنەی جیابوونەوەکان

ئەم فراوانییەی نەدەبوو، بەڵکو لەسنوورێکی کەمدا دەمایەوە کە ئەویش تەواو ناچارانە دەبوو.

**ئینجا سەبارەت بەم فەرموودانە:** ((خير نسائها مريم، وخير نسائها خديجة، ڕەخنەی هەیە، کە بۆچی فاتیمەی تێدا نییەو فەزڵی عائیشە باس کراوە و ئافرەتی موژدە پێدراوی بەهەشت بوونی نییەو پیاوانی کامڵ لەئافرەت زۆرتر هەن و لەئافرەتان تەنیا ئاسیای ژنی فیرعەون و مەریەمی کچی عیمران.

یەکەمجار دەبێ ئەو فەزڵەی باس بکردایە کە ئیسلام هەیەتی، فەزڵ و گەورەیی مەریەمی دایکی مەسیحی(سەلامی خوایان لەسەربێ) باسکردووە کە جێی شانازیە بۆ ئێمەی موسڵمان وەك ئەوانەی جولەکە تانەی لێ نادەین و فەزڵ و مەزنیی ئەو ئافرەتە داوێن پاکە ئەزانین، نووسەر ئەوەشی با لا ڕوون بێ کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)فەزڵ و گەورەیی فاتیمەشی باسکردووە(خوای لێ ڕازی بێ):((سيدات نساء أهل الجنة بعد مريم ابنة عمران، فاطمة، وخديجة، وآسية امرأة فرعون، واتا: گەورەی ژنانی بەهەشت لەدوای مەریەمی کچی عیمران، فاتیمەو خەدیجەو ئاسیای ژنی فێرعەونە.

پاشان کامڵ بوونەکە هیچ کێشەیەکی تێدا نییە، کامڵ بوونی پیاوان هی پەیامبەرەکانە کە چاودێریی خواییان هەبووەو پارێزراو بوونە، سەربووردەی مەریەمی کچی عیمران و ئاسیای ژنی فیرعەونیش

دیاره کە چۆن ڕووبەڕووی هەموو ناخۆشییەك بوونەتەوەو بەو هۆیەوە چوونەتە ڕیزی کامڵ بووانەوە، چونکە وەك قەلأیەك بوونە لەورەو باوەڕو مرۆڤەکانی تر ئەو ورەو تینەیان نییەو وەك ئەوان کامڵ نەبوونە. پاشان فەزڵی دایکە عائیشەش بووەتە کوێرایی چاوی خراپەکاران و بژاردەی خوای گەورە بووە بۆ پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)و گێڕەرەوەی فەرموودە و کچی ئەبو بەکری ڕاستگۆ بووە، خۆیشی لەخەدیجە باشتر نەزانیووە، بەڵکو خۆی دەیگێڕێتەوە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)ئەوەندە باسی خەدیجەی ئەکرد لەکاتێکدا کۆچی دواییشی کردبوو ئەم وەك هەر ئافرەتێکی تر لێی دەکەوێتە غیرەوەو خۆیشی ئەگێڕێتەوە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)زۆرێك چاکەو گەورەییەکانی خەدیجەی بۆ گێڕاوەتەوە، ئەم گێڕانەوەیەی دایکە عائیشە(خوای لێ ڕازی بێ)بەسە بۆ دەمکوتکردنی نمونەکانی زەکەریا ئۆزۆن. لەنێو ئافرەتانیش موژدەی بەهەشت هەیە، نەك هەر موژدە، بەڵکو گەورەی ئافرەتانی بەهەشتیشن وەك پێشتر گێڕامانەوە کە پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ئەفەرمووێت:((سیدات نساء أهل الجنة بعد مريم ابنة عمران، فاطمة، وخديجة، وآسية امرأة فرعون، واتا: گەورەی ژنانی بەهەشت لەدوای مەریەمی کچی عیمران، فاتیمەو خەدیجەو ئاسیای ژنی فیرعەونە.

لێکدانەوەیەکی نابەجێی بۆ ئەم فەرموودەیە کردووە کە پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ئەفەرمووێت: ((لَوْلَا بَنو اسرائيل لم يخنز اللَّحْم وَلَوْلَا حَوَّاء لم تخن أُنْثَى زَوجهَا.

نۆوزۆن دەڵێ: چۆن گۆشت بۆگەن ئەبێ ئافرەتیش ئاوەها خیانەت ئەکات و خیانەتی بەداوێن پیسیی لێکداوەتەوە. واتای فەرموودەکە ئەمەیە: بەنو ئیسرائیل ڕێگریی شەرعییان لەسەر بووە گۆشت گل بدەنەوەو هەڵیبگرن، ئەم فەرمانەیان بەجێ نەهێنا ئیتر بووە سرووشتێك گۆشتی گلدراوە بۆگەن بکات، ئادەمیش کە لەبەهەشت دەرکرا وتی: ئەمە خیانەتی حەوا بوو منی لەبەهەشت وەدەرنا، ئەو شەیتان خواردنی بەری دارەکەی بۆ جوان کردو حەواش لای من جوانی کرد. حاشا، حەوا خیانەتەکەی داوێن پیسیی نەبووە تاوەکو زەکەریا ئۆزۆن لێکدانەوەی خراپی بۆ بکات. وشەی خیانەت بۆ زۆر مامەڵەی تر بەکاردەهێنرێ، مرۆڤێ لەخشتەت ببات، لەپشتەوە خنجەرت لێ بدرێ، ڕاستگۆیانە دەقێك نەگەیەنی و زۆر شتێکی ترو داوێن پیسیش یەکێکە لەخیانەتەکان. ئەکرێ خیانەتی ئافرەت لەمێردەکەی گێڕانەوەو ئاشکراکردنی سەرجێی بێ بۆ ئافرەتانی تر، دەرکردنی پارەی گیرفانی بێ ئەوەی پێی بزانێ و بێ ئەوەی ژنەکەی بکۆڵێتەوە کە بەچی زەحمەتێك مێردەکەی ئەم پارەیەی پەیدا کردووەو زۆر شتی تر کە لەهەندێ خێزاندا ڕوودەدەن. بەڵکو لەم فەرموودەیەدا ئەوە دەفامین، پیاو دەبێ وەك باوکە ئادەم بێ ئەگەر هەڵەیەکی وەهاشی لەخێزانەکەی بینی و پەشیمان بوونەوەی

تێدا هەبوو با درێژە بەژیان بدات و خۆشەویستیی بهێنێتەئاراوە، ئەمە سەرباری ئەوەی هەڵەی خودی باوکی ئادەمیشی تێدا هەبوو کە لێرەدا جێی باسکردن نییە، گرنگ ئەوەیە بەهەڵەیەك ژیانی هاوسەرێتیی وێران نەکرێ.

لەلاپەڕە(٢١٠) فەرموودەیەکی هێناوەتەوە کە پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی:((قمت على باب الجنة، فكان عامة من دخلها المساكين، وأصحاب الجد محبوسون غير أن أصحاب النار قد أمر بهم إلى النار، وقمت على باب النار فإذا عامة من دخلها النساء، واتا: لەبەردەرگای بەهەشت ڕاوەستام، زۆربەی ئەوانەی دەچوونە بەهەشت هەژارەکان بوون، دەوڵەمەندو دەسترۆیشتووەکانیش ڕاگیرابوون بۆ لێپرسینەوە، دۆزەخییەکانیش فرمانی خرانە دۆزەخیان بەسەردا درابوو، لەبەردەرگای دۆزەخیش ڕاوەستام زۆربەی خەڵکەکەی لەئافرەتان بوون.

ئەمەو فەرموودەی خوارتریش وەڵامی ئەمەی داوەتەوە، کە نەفرەت دەکەن و سپڵەیی ئەکەن بەرانبەر پیاوەکانیان، هۆکاری تریش هەیە، کە زۆرجار بوختان و قسە هەڵبەستن بۆ ئافرەت لەنێو خودی ئافرەتانەوەیە بەزۆریی، هەندێجار لەبوختان هەڵبەستندا ئافرەت تیاچووەو هۆکارەکەشی خودی ئافرەت بووە، لەدوژمنایەتی یەکترو خۆدانەپۆشین و شت گەلی تر، بەلام پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ئامۆژگاریی ئافرەتانی کردووە کە

خێرو سەدەقە بکەن و لەو کارانە نەکەن بیانباتە دۆزەخەوە، بەهەشت جێگەی ئەو ئافرەت و پیاوە باوەڕدارانەیە کە پەیڕەوی ڕێبازی خوا دەکەن و شوێن گومان و بێباوەڕیی ناکەون، ئەم فەرمایشتەی پەیامبەری ئازیزیش وریاییدانە تا ئافرەتان زیاتر پابەندی پەیامی خوا بن و چاك بن و نهێنییەکانی ژیانی هاوسەرییان بپارێزن.

ئەم فەرموودەیەشی هێناوەتەوە تا بیسەلمێنێ کە ئیسلام ئافرەتی بەکەم عەقڵ داناوە، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: «يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ وَأَكْثِرْنَ الِاسْتِغْفَارَ. فَإِنِّي رَأَيْتُكُنَّ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ» فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ جَزْلَةٌ «١» : وَمَا لَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَكْثَرُ أَهْلِ النَّارِ؟ قَالَ: «تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ. وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ. مَا رَأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَغْلَبَ لِذِي لُبٍّ مِنْكُنَّ» قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا نُقْصَانُ الْعَقْلِ وَالدِّينِ؟ قَالَ «أَمَّا نُقْصَانُ عَقْلِهَا. فَشَهَادَةُ امْرَأَتَيْنِ تَعْدِلُ شَهَادَةَ رَجُلٍ. فَهَذَا نُقْصَانُ الْعَقْلِ. وَتَمْكُثُ اللَّيَالِي لَا تُصَلِّي وَتُفْطِرُ فِي رَمَضَانَ فَهَذَا نُقْصَانُ الدِّينِ» ، واتا:پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)بەلای کۆمەڵێ ئافرەتدا تێپەڕی فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ژنان سەدەقەو ئیستیغفاری زۆر بکەن، چونکە بینیوومە ئێوە زۆرینەی خەڵکی دۆزەخن، ئافرەتێکی کەڵەگەتیان لەنێودابوو وتی: بۆچی ئەی پەیامبەری خوا زۆرینەی خەڵکی دۆزەخین؟ فەرمووی: نەفرەت زۆر دەکەن و چاکەی مێردەکانتان لەبیر ئەکەن، نەمبینیوە کەم عەقڵ و ئایین بەنمونەی ئێوە بیری پیاوی ژیر ببەن. وتی: ئەی

پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)کەم عەقڵ و ئایینمان لەچیدایە؟ فەرمووی: ئەوەیە شایەتیی دوو ئافرەت بەرانبەر بەپیاوێکە ئەمە کەمیی عەقڵ و لەمانگێکیشدا بەهۆی سووڕی مانگانەوە نوێژو ڕۆژوو ناگرێ، ئەمە کەمیی ئاییندارییە. ئەو ئافرەتانە تێگەیشتن مەبەستی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)سووکایەتیی نییەو سووکایەتی لەو ناوەشێتەوە.

زۆرن ئەوانەی لەموسڵمان و نا موسڵمان سەقەت لەم فەرموودەیە گەیشتوون، دوو جۆر عەقڵمان هەیە، عەقڵی ڕوشدو عەقڵی ئیدراك(پەی بردن)، زۆرن ئەو پیاوانەی کەم عەقڵن لەڕووی ڕوشدەوە، چونکە ئاینداریيان لاوازەو بەش بەحاڵ لەخوا ترسانیان نییە، بەڵام ئەمەی ئافرەت عەقڵی ئیدراکە[1]. ئەو پیاوو ئافرەتانەی عەقڵی ڕوشد(فامداریيان)ناخەنەگەڕ بۆ خواناسین تاوانبارن، بەڵام لەعەقڵی ئیدراکدا تۆمەتباریی نییە، هەرگیز مەبەستی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)سووکایەتی کردن نەبووە بەئافرەت، بەڵکو مەبەستی بووە ئاگاداریان بکاتەوە کە بەهۆی سووڕی مانگانەو سکپڕی و منداڵ بوون و ئازارەکانی تری ژنانەوە فریای کاتەکانی تر بکەون و ئاینداریيانی پێ بەهێز بکەن. خودی ئافرەتانیش باش لەمە دەزانن نەخۆشییەکانی ژنان چی

[1] - بڕوانە: محمد بن صالح بن محمد العثيمين: تفسير الفاتحة والبقرة ج٢، ص٤٢٠، دار ابن الجوزي، ط١، ١٤٢٣هـ

کاریگەرییەك ئەخاتە بیری ئافرەتانەوە، چەندە جەنجاڵ و پەرێشانی ئەکات و ئیدراکیان کەم ئەکاتەوە.
لەبابەتی شایەتیشدا دەبێ بزانین، ئیسلام شایەتیی هەموو پیاوێك قبوڵ ناکات، نابێ پیاوەکە تاوانی گەورەی هەبێ و بەتاوانی بچووکیش بەردەوام بێ، چونکە شایەتیدان بەناهەق لەتاوانە گەورەکانە، بۆیە لەدادگای شەریعەتدا زەکەریا ئۆزۆن وەك شایەتێك قبوڵ ناکرێ بۆیە پەنای بردووەتە بەر وەها باسێك! پاشان ئەو شایەتیدانەی دوو ئافرەت بەرانبەر بەپیاوێك دانراوە تەنیا بۆ بیرهێنانەوەی یەکترە، شایەتیدانە لەبابەت کاری بازرگانی کە کاری ئافرەتان نییە(دەگمەن گشتگیر ناکرێ)، کوشتن و شەڕو شۆڕیش بەناسکیی هەست و سۆزی ئافرەت گونجاو نییە، شایەتیدان لەم بوارانە گرانەو مەترسیی زۆرترە، لەهەندێ شایەتییدا تەنیا شایەتیی ئافرەت وەردەگیردرێت ، وەك شایەتیی لەنەخۆشیی ئافرەتان و سکپڕی و شیردان و کاروبارەکانی تری بواری خۆی.
ئەگەر ئافرەت لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)کەم عەقڵ بێ بەپێی تێگەیشتنی ئەوان، بۆچی پەیامبەری ئازیز لەئاشتیی حودەیبییەدا شوێن ئامۆژگاریی ئوم سەلەمەی خێزانی دەکەوت(خوای لێ ڕازی بێ)؟ بۆ هاوەڵان فەرموودەیان لەدایکە عائیشە وەردەگرت(خوا لەهەموویان ڕازی بێ)؟ بۆ عومەری کوڕی خەتتاب(خوای لێ ڕازی بێ)لەسەر مینبەر دانی پێدا دەنا عومەر هەڵەی کردو ئافرەتێك ڕاستی کردەوەو پێکای؟

جا پێویسته زەكەریا ئۆزۆن و هاوشێوەكانی دان بەوەدا بنێن كە لەڕووی فیسۆلۆجییەوە جیاوازیی لەپیاو و ئافرەتدا هەیە، زۆرێك هۆ هەیە وەها بكات ئافرەت زیاتر ماندووتر بێ و لەو ماندوویەتییەشدا تاوانبار نیین، ئەوە ئەو پیاوانە تاوانبارن كە هیچ قورساییەكی نمونەی قورسایی ژنانیان نییەو بەمەستی شەراب و گومانەوە لەخوا خۆیان بەدوور دەگرن و تانە لەفەرمایشتەكانی پەیامبەرەكەی دەدەن[1].

فەرموودەی(١١)ی لاپەڕە(٢١٣)ی كردووەتە ئەوەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ئافرەتی بەمایەی نەگبەتیی داناوە كە دەفەرمووێت: ((إِنَّمَا الشُّؤْمُ فِي ثَلَاثَةٍ: الْمَرْأَةُ وَالْفَرَسُ وَالدَّارُ، واتا: نەگبەتیی لەسێ شتدایە: ئافرەت، مایین، خانوو.

سەرەتا دەبێ ئەوە ڕوونبكرێتەوە كە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)مەبەستی تێكڕای ئافرەتان نەبووە، ژنی خراپ(هەروەك پیاوی خراپ)مرۆڤ تووشی دەردەسەریی ئەكات، مایینی خراپ(لەئێستادا ئۆتۆمبێلی خراپ)مرۆڤ پیر ئەكات، خانووی بەرتەسكیش مرۆڤ دڵتەنگ ئەكات و كەس نییە نكۆڵیی لەم ڕاستییە بكات، بەڵام ئەگەر زەكەریا ئۆزۆن ڕاستگۆ بوایە، دەبوو ئەو

---

[1] – بۆ زانیاریی زیاتر: بڕوانە: گۆڤاری زانستی سەردەم:پیاو و ژن یەكسانن، بەڵام جیاوازن، نووسینی: ئەلین ویلر، پەرچڤەكردنی: دانا، ژمارە٣٦ساڵی٩تشرینی دووەمی٢٠٠٨خەزەلوەری ٢٧٠٨، ل١٦٠– ١٦٥.

فەرموودەیەی تریشی باس بکردبایە کە دەفەرمووێ: ((أَرْبَعٌ مِنَ السَّعَادَةِ: الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ، وَالْمَسْكَنُ الْوَاسِعُ، وَالْجَارُ الصَّالِحُ، وَالْمَرْكَبُ الْهَنِيءُ، واتا: بەختەوەریی لەچوار شت دایە: ئافرەتی باش، خانووی بەرفراوان، هاوسێی باش، سواریی لەبارو باش. پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)بەم فەرموودانەی ڕێنمایی موسڵمانان ئەکات کە نەبنە هۆی ناڕەحەتکردنی یەکتر بەتایبەت لەنێوان ژن و مێرددا و پێش کاتی خۆی یەکتر پیر بکەن، بەڵام ئۆزۆن شەش و پێنج ئەکا!

دواتر ئەم فەرموودەیە ئەگێڕێتەوەو بەفەرمایشتی دایکی ئیمانداران عائیشە(خوای لێ ڕازی بێ)بەراوردی ئەکات، ((عن مسروق، عن عائشة وذكر عندها ما يقطع الصلاة: الكلب والحمار والمرأة. فقالت عائشة: شبهتمونا بالحمير والكلاب، والله لقد رأيتُ رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يصلي وأنا على السرير بينه وبين القبلة مضطجعة، فتبدو لي الحاجة، فأكره أن أجلس، فأوذي رسول الله صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فأنسل من عند رجليه، واتا: لای عائیشە باسکرا کە سەگ و کەرو ئافرەت نوێژ دەبڕن، ئەویش وتی: ئێمەتان بەسەگ و کەر شوبهاند، سوێند بەخوا پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)م بینی نوێژی ئەکردو منیش لەسەر ڕاخەرەکە ڕاکشابووم و کەوتبوومە ڕوو بەقیبلەی، گەر پێویستییەکم هەبوایە حەزم نەدەکرد ئازاری بدەم و لەنێو قاچەکانیدا خۆمم دەردەکرد.

ئەم فەرموودەیەی پێشەوا بوخاریی هێناویتییەوە هیچ شتێکی تێدا نابینرێ و لەناونیشانەکەیدا جوان ڕووندەبێتەوەو بەڵگەی ئەو کەسانەیە کە بۆچوونیان وەهایە هیچ شتێك نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، ئینجا دایکە عائیشە بەهۆی نەبیستنی فەرموودەی لەم شێوەیەو ڕەنگە زبر دەربڕینی لەلایەن کەسەکەوە دایکە عائیشەی وەها نیگەران کردبێ، پەیامبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)ئامۆژگاریيمانی کردووە لەکاتی نوێژکردندا سیترە دابنێین تا کەس ڕاستەوخۆ بەپێش نوێژماندا تێنەپەڕێ نەك ڕاکشابێ و بۆچوونێکی فیقهییە کە ئایە ئافرەتی سووڕی مانگانە نابێ تێپەڕێ یان لەسووڕی مانگانە نەبێ، تێپەڕبوونەکە نوێژ بەتاڵ ئەکاتەوە یان خێرەکەی کەم ئەکاتەوە، جا چۆن نەهی کراوە ئافرەت بەبەردەم نوێژخوێندا تێپەڕبێ بەبێ سیترە، بۆ پیاویش هەمان نەهی هاتووە.

هاتووە بەفەرموودەیەکی تردا ژەهری خۆی ڕژاندووە، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ئەفەرمووێت:«ما ترکت بعدي فتنة هي أضر علی الرجال من النساء»، واتا: لەدوای خۆم هیچ فیتنەیەکم بەجێ نەهێشتووە بەقەد ئافرەت زیانی بۆ سەر پیاوان هەبێ. زەکەریا ئۆزۆن دەڵێ: ئیسلام ئافرەتی بەئاشووبەو فیتنە ناوبردووە، بێ ئاگا لەوەی فیتنە بەواتای تاقیکردنەوە هاتووە لێرەدا، زۆر جار پیاوی ژیر و خاوەن ناوبانگ بەهۆی جوانیی و فێڵی هەندێ ئافرەتەوە لەخشتەبراوە، لەڕووی نێودەوڵەتیشەوە ڕوویداوە بەئافرەت سیاسەتمەداران شەرمەزار بکرێن و پیاو زیاد لەسنوور

حەزی بەئافرەتە، ئەمەش شتێکی سرووشتییە لەپیاوداو کەم کەس هەیە ئەم ڕاستییە ڕەتبکاتەوە. ڕوویداوە بەهۆی سرنجڕاکێشیی ئافرەتێکەوە پیاوێك دەستبەرداری ژن و منداڵی خۆی بووە، سووك و شەرمەزار کراوە، کەس هەیە ئەم ڕووداوانە بەتاقیکردنەوە و فیتنە نەزانێ! لەکاتێکدا پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)بەم ورياييدانەی ئاگادارمان ئەکاتەوە ژیانمان ڕێکبخەین و نەکەوینە داوەوە چ پیاوبێ یان ژن.

ئافرەتی باش فیتنە نییە، هەروەك پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم) ئەفەرمووێت: «الدُّنْيَا مَتَاعٌ، وَخَيْرُ مَتَاعِهَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ، إِنْ نَظَرَ إِلَيْهَا سَرَّتْهُ، وَإِنْ أَمَرَهَا أَطَاعَتْهُ وَإِنْ غَابَ عَنْهَا حَفِظَتْهُ فِي نَفْسِهَا وَمَالِهِ»، واتا:دونیا چێژو خۆشییە، باشترینی خۆشییەکانی ئافرەتێکی باشە، کە سەیری بکەی دڵخۆشت بکات، فرمانی مێردەکەی بەجێبهێنێ و لەنادیار بوونی مێردەکەشیدا خۆی و ماڵی بۆ بپارێزێ. ئەی ئۆزۆن بۆ ئەمەی باس نەکردووە! ؟ دونیایەکی سەیرە، خەڵکانێك هەن پێیان ئاساییە ژنە فەرمانبەرەکان گوێڕایەڵی بەرپرس و بەڕێوەبەرەکانیان بن، بەڵام بەوتنی گوێڕایەڵیی ئافرەت بۆ مێردەکەی حەساسییەت ئەیانگرێ!

ئینجا هاتووە کوێرانە تێکڕای ئافرەتانی بەدوژمن داناوە لەم ئایەتەدا:﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَـٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ ۚ وَإِن تَعْفُواْ وَتَصْفَحُواْ

وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ التغابن: ١٤ ، واتا:ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە....هەندێك لەهاوسەرانتان یان هەندێك لەڕۆڵەو نەوەكانتان دوژمنتانن.....جا ئێوەش وریابن و خۆتان بپارێزن لێیان، جا ئەگەر چاوپۆشی لەهەڵەیان بكەن و واز لەئازاردانیان بهێنن و لێیان ببورن، ئەوە چاك بزانن كە خوا لێخۆشبووەو میهرەبانە.

ئایەتەكە وشەی(مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ)ی تێدایە، ( مِنْ )(تبعیض)ە، واتا: هەندێك، دەبوو ئەوەی ڕوونبكردبایەتەوە، بەڵام ئەمانەتی زانستیی لای وەها مرۆڤێك لەكوێدا هەیە!لەكاتێكدا لەكۆتایی ئایەتەكەدا داوای لێبووردنیان بۆ ئەكات و زانایان هەر شتێكیان لەڕاڤەكەیدا وتبێ تەنیا مەبەستیان ئەو هەندەكییە بووە، هەروەكو هەندەكییەكی تری پیاوانیش خراپ و نالەبارن.

**لەبارەی فەرموودەی(١٤) لاپەڕە(٢١٨)دا** كە پەیامبەری خوا(صلى الله علیه وسلم)بەجابری كوڕی عبدالله(خوا لەخۆی و باوكی ڕازی بێ)دەفەرمووێ:((حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ، قَالَ: سَمِعْتُ شُعْبَةَ، يُحَدِّثُ غَيْرَ مَرَّةٍ، عَنْ مُحَارِبِ بْنِ دِثَارٍ، قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ، يَقُولُ: تَزَوَّجْتُ ثَيِّبًا، فَقَالَ لِي النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " مَا لَكَ وَلِلْعَذَارَى وَلِعَابِهَا:كچت هێنا یان بێوەژن؟ ئەڵێ:بێوەژن. پەیامبەری خوا(صلى الله علیه وسلم)دەفەرمووێ: كچت بۆ نەهێنا تاوەكو یاری و

دەستبازیی لەگەڵدا بکەی؟ زەکەریا ئۆزۆن لەم بارەیەوە دەڵێ:
مەبەست لەم فەرموودەیە و دانە پاڵ پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)تەنها و تەنها ڕازیکردنی کۆمەڵگەیەکی نێرسالارە....
لەم فەرموودەیەدا چی نێرسالارییەك هەیە! پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)لەهاوەڵێکی خۆی دەپرسێ ژنت هێناوە یان نە؟ ئەویش ڕوونیدەکاتەوە بەڵێ:ژنم هێناوەو بێوەژنە، کە پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)پێیدەفەرمووێ: بۆ کچت نەهێنا مەبەستی حەرامبوونی مارەکردنی بێوەژن نییە، تەنیا ویستوویەتی بزانێ هۆکار چییە وەك گەنجێك یەکەمین پرۆسەی هاوسەرگیرییەکەی لەگەڵ بێوەژنێکدا بووە؟لەگشتی گرنگتر ئەم باس و خواسە لەساتەکانی شەڕدا بووەو پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ویستوویەتی کەمێك ماندوویەتی جابر دەربکات و جابر تاقانەو کوڕی هاوەڵی بەڕێز(عبدالله)یەو شەهید بووە، حەزی کردووە لەکوڕی هاوەڵەکەی بپرسێت، لەفەرموودەیەکی دووروودرێژیشدا جابر ڕوونیدەکاتەوە کە ئەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)باوکم تازە کۆچی کردووەو منیش چەند خوشکێکم هەیەو تەنیا ئەم بێوەژنە دەتوانێ لەگەڵیاندا هەڵبکات، ئیتر نازانم زەکەریا ئۆزۆن ئەم نێرسالارییەی لەکوێوە هێنا!

**لەفەرموودەی(٢٢٠)** باسی ئەو فەرموودەیە ئەکات کە ئافرەتێك دێت و دەڵێ ئەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)خۆمت پێشکەش

ئەکەم، پەیامبەریش سەیری کردو سەری دانواندو هیچی نەفەرموو، پیاوێك لەهاوەڵان هەڵسایە سەرپێ و وتی:ئەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)ئەگەر خۆت ناتەوێ لەمنی مارە بکە، پەیامبەریش(صلی الله علیه وسلم)فەرمووی:هیچت هەیە بۆ مارەیی؟ سەرەنجام کابرا ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیشی دەست نەکەوت و لەبەر سورەتێك لێی مارە کرد.

**زەکەریا ئۆزۆن دەڵێ:** بۆ ئافرەت ئاژەڵ و شمەك و کەلوپەلە بەو جۆرە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ؟ بۆ ئافرەتانی موسڵمان لەم سەردەمەدا بەئەنگوستیلەی ئاسن یان بەچەند سورەتێکی قورئان رازی نابن شوو بکەن؟

سەرەتا ئەم ئافرەتە خۆی ئامادە بووە شوو بکات و لەبابەتی فیقهدا ئەمە باسکراوەو ڕێگە دراوە ئافرەت لەکەسی باش داوا بکات مێردی پێ بکات و ئازادییەکە ئیسلام داوێتی و خۆیشی بەو بڕیارەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)رازیی بووە، دەنا لای ئۆزۆن و هاوبیرەکانی ڕوونە، لەئیسلامدا کچ بەزۆر بەشوو نادرێت، چ جای ئەوەی ئەم ئافرەتە بەخۆی هاتووەو داوا دەکات مێرد بکات. ئینجا ئەوەی کچانی موسڵمان لەمڕۆدا بەئەنگوستیلەیەکی ئاسن یان چەند سوورەتێکی قورئان ڕازیی نەبن شوو بکەن هیچ شتێك ناخاتەسەر ئەم فەرموودەیە، چونکە لەئیسلامدا سنووری مارەیی دیاری نەکراوە، ئافرەتەکە ئازادە مارەیی ئەوێ یاخود ناوێ، یان زەکەریا

ئۆرزۆن بەچی بەڵگەیەك ئەوە ئەسەلمێنێ ڕووینەدابێ لەم سەردەمەدا بەلەبەرکردنی قورئان یان ئەنجامدانی حەج و عومرە مەرجی کچانی موسڵمان نەبووبێ بۆ شوو کردن؟ پاشان تۆمەت ئەخاتە پاڵ پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)کە دەستی خستووەتەسەر ژنان و جوان نەبووبێ نەیانی ویستووەو باسی صەفییە ئەکات کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)لەدوحیەی کەلبیی سەندووەو کردوویەتییە ژنی خۆی.

وەڵام: ئەم قسەیەی ئۆرزۆن تۆمەتێکی ناشیرین و قسەیەکی بێ بەڵگەو کلکو گوێ کراوە، چونکە بەپێی بەڵگەکان هیچ شتێکی لەو جۆرە ڕووینەداوە: هەموو ئەوەی هاتبێ و ئەم جۆرە کەسانە بیکەنە بیانوو ئەمەیە، یەکێکە لەبۆچوونەکان:ئەنەس ئەگێڕێتەوە کە سەبایەی خەیبەر کۆکرایەوەو دوحیە هات و وتی:ئەی پەیامبەری خوایە جارییەیەکم پێ بدە، پەیامبەریش(صلی الله علیە وسلم)فەرمووی:بڕۆ جارییەیەك ببە، دوحیەش ڕۆیشت صەفیەی برد، بۆیە پیاوێك هاتەلای پەیامبەر(صلی الله علیە وسلم)و فەرمووی:ئەی پەیامبەری خوا(صلی الله علیە وسلم)صەفیەی کچی حویەی گەورەی قورەیزەت بەدوحیە داوە، ئەو ئافرەتە تەنیا بۆ تۆ شیاوە، پەیامبەریش فەرمووی:بڵێ با بیهێنێ. کە هێنای فەرمووی: جارییەکی تر ببەو پەیامبەریش ئازادی کرد سەرپشك بێ بەباوك و کەسوکاری بگاتەوە یا ببێتە خێزانی، ئەویش پەیامبەری خوای هەڵبژارد. پێشتر صەفیە تازە بووك بوو بۆ کینانەی کوڕی ڕەبیعی

کوڕی ئەبی ئەلحوقەیق، صەفیە لەخەودا بینیبووی مانگێك کەوتووەتە کۆش و ماڵەکەی، خەوەکەی بۆ مێردەکەی گێڕایەوەو کینانە وتی: خەون دەبینی و ئومێد ئەکەی ببیتە خێزانی موحەممەدی پادشای حیجازو زللەیەکی بەنێوچاوانیدا دا، کە هێنایانە لای پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)شوێنەواری ئەو زللەیەی بەنێوچاواندا مابوو بۆ پەیامبەری خوای گێڕایەوە.

ئینجا هاتووە تانەی داوە لەو فەرموودەیەی کە نابێ: زیاد لەسێ ڕۆژ تازێباریی بۆ مردوو بکرێ جگە ئافرەتێك کە مردووەکە مێردی بێ و ڕەخنە دەگرێ وەك ئەوەی هەست و سۆزەکانی مرۆڤ بەڕۆژوو شەو دیاری بکرێت لا٢٢٨.

ئیسلام ئەگەر مرۆڤی ناچار بکردبایە بۆ مردووەکەی چەند ساڵێك لەخەفەتباریی و گریاندا بێ ئەیانووت ئیسلام مرۆڤی لەبەدبەختی و گریاندا هێشتووەتەوە! کە هاتووە و دیاریی کردووە تازێباریی لەسێ ڕۆژ زیاتر نەبێ هەم هاتوون گێچەڵی پێ دەگێڕن بۆ ناهێڵێ مرۆڤ تازێباریی خۆی دەربخات! ئیسلام بەم سنووردارکردنە نەیویستووە مرۆڤە مردووەکە لەبیربکرێ، نەخێر، بەڵکو دەیەوێ مرۆڤەکانی تر کە کەسوکاری مردووەکەن ڕابێنەوە لەگەڵ ژیانی سرووشتیدا و وردە وردە لەخەم و خەفەتەوە ڕزگاریان بێ، نەك خەمۆك بن، حەرامکردنەکە بۆ ئەوە نییە مرووەکە لەبیر بکەی، بەڵکو نابێ بەرگی شین و ڕەشی تەعزێباریی لەبەر بکرێ بۆ جگە ژنی مردووەکە، بەتایبەت ئەوە دەبینرێ بەزۆری زۆرداریی بەرگی

ڕەش و شین لەبەر هەموو ئافرەتانی بنەماڵە ئەکرێ بێ ئەوەی زۆربەیان بەمە ڕازی بن، بەڵام لەبەر شەرم و ناچاریی پێی ڕازیی ئەبن.

بۆ ئافرەتیش ئەو ماوەیە دیاریی کراوە وەك ڕێزێك بۆ مێردەکەی و لەوەش گرنگتر تا بەسەرچوونی ماوەی عیددەکەی ئاخۆ سکی هەیە یان نەو دواتر ئازادە ژیانی تر دەست پێبکاتەوە.

**ئینجا هاتووە ئەبو هورەیرەی بەپیاوێکی پڕ لەگرێ و دەروون** نەخۆش دەبینێ لا٢٢٩. ئەمە بێ ئەدەبییەکی لەڕادەبەدەرە بەرانبەر بەم هاوەڵە بەڕێزە ئەنجامی داوە، مرۆڤە بێ ڕێزەکان هەمیشە زمانی درێژیان خستووەتەسەر ئەو هاوەڵانەی زۆرتر فەرموودەیان گێڕاوەتەوەو زۆرتر دەقی شەرعییان بەئێمە گەیاندووە. ئەگەرچی خۆیان ناتوانن ببنە موسڵمانێکی تاوانباریش ، هەوڵیان ئەوەیە خراپەکارانی دەوری خۆیان زۆرتر بکەن و سەنگەری شەیتان لەباوەڕداران تۆکمەتر بکەن، خەیاڵیان خاوە، ئەوە زەکەریا ئۆزۆنە تووشی گرێ و نەخۆشیی دەروونیی هاتووەو بەڕاست و چەپدا پەلاماری ئایەت و فەرموودەو هاوەڵان ئەدات و کاری خۆی بەجێهێشتووە.

باسی قەوامەو دوو شایەتی ئافرەت بەرانبەر بەپیاوێکی کردووەتەوەو ئێمەش پێشتر باسمان کردوو قەوانەکەی لێ نادەینەوە.

**لەلاپەڕە(٢٣٢)بالآپۆشیی شەرعیی داناوە بەدیلکردنی ئافرەتی موسڵمان، وەك ئەوەی حیجابەکەی ڕێگربێ لەوەی زانست بچێتە گوێیەوە! ئەم نەزانیە قسەو پیشەی خەڵکانێکە وەها دەزانن زانست وەرگرتن گۆڕەپانی ڕاکردنە! بێ ئاگا لەوەی زۆربەی خوێندکارە زیرەکەکانی ولآتانی موسڵمان بالآپۆشن و بالآپۆشییان هیچی بۆیان دروست نەکردووە، بەلآم زەکەریا ئۆزۆن کە نەخۆشیی دەروونیی هەیە، بەبینینی بالآپۆش شێتییەکەی بەرز دەبێتەوە.**

**سەبارەت بەوەی دەنگی ئافرەت بەعەورەت دانرابێ، ئۆزۆن پێچەوانە بۆی ڕۆیشتووە، بەڵکو نەهییەکە لەوەدایە ئافرەت بەرانبەر بەپیاوی بێگانە دەنگی ناسك بکاتەوە، چونکە کار دەکاتەسەر پیاوە دڵ نەخۆش و ئەوانەی پەرێشان ئەبن.**

**حیجابیش تەنیا سەرپۆش نییە، خوای گەورە ئەفەرموویێت:** ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ

جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ النور: ٣١،

واتا:بەئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن(لەتەماشای نامەحرەم)داوێنی خۆیان بپارێزن لەگوناهو جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دیارە(وەك دەم و چاوو دەست)با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیانداو جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن بەتەواوی بۆ هاوسەرەکانیان نەبێت، یان باوکی خۆیان، یان باوکی مێردەکانیان، یان کوڕی خۆیان، یان کوڕی مێردەکانیان، یان بۆ براکانی خۆیان، یان برازاکانیان، یان خوشکەزاکانیان، یان ئافرەتێك کە پەیوەندیان پێکەوە هەیە، یان ئەوانەش کە کەنیزەکەکانیان(کە لەبارودۆخی تایبەتدا هەبوون)یان ئەوانەی کە لەماڵەکانیاندا دەژین و پێویستیان بەئافرەت نییە(لەبەر پیری، یان نەخۆشی....هتد)یاخود ئەو منداڵانەی کە هێشتا شارەزاییان لەئافرەت نیەو(ئارەزووی جینسیان بۆ دروست نەبووەو نازانن باسی عەورات بکەن)نابێت ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەن و پێیان بدەن بەزەویدا(تا دەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت)و بزانرێت کە زینەتدارو خشڵدارن، کەواتە هەمووتان ئەی ئیمانداران بەرەو لای خواو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی ڕزگارو سەرفرازبن.

**جا قورئان هاتووە تەنیا سەرپۆشی کاتی نوێژکردنی بەفەرز داناوە،** لەکاتێکدا خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ

﴿وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾﴾ الأحزاب: ٥٩، واتا:ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)بەئافرەتانی ئیماندار بڵێ: کە بە پۆشاکی باڵا پۆش خۆیان داپۆشن ئەوە لەبارترین شتە کە پێی بناسرێن، تا ئازار نەدرێن و (تووشی گیروگرفت نەبن)، هەمیشە و بەردەوام خوا لێخۆشبوو میهرەبانە(لەکەم و کوڕی ڕابردووتن خۆش دەبێت).

پێویستە ئافرەتانی موسڵمان وریای ئەم وڕینە ژەهراوییە بن و شاعیریش دەڵێ:

أختاه يا بنت الآباة تحشمي

لاترفعي عنك الخمار فتندمي

إنَّ هذا الخمار يزيد وجهك بهجة

وحلاوة العينين أن تتلثمي

ودعي هراء القائلين سفاهة

أن التقدم بالسفور الأعجمي

واتا:خوشکی شیرینم کچی باوك پۆشتەبە، سەرپۆش فڕێ مەدە پەشیمان دەبیتەوە، بێگومان سەرپۆش جوانیی زیاتر بەڕوومەتت دەدات و جوانیی چاویش لەداپۆشینی دایە، واز لەقسەی پڕوپووچ و وڕینەی ئەوانەش بهێنە کە دەڵێن پێشکەوتن بەخۆ ڕووتکردنەوەی بێگانەکان ئەبێ.

تانـەی زەکـەریا ئـۆزۆن کاریگـەریتان نەکاتەسـەر بـەوەی ئیسـلام ئافرەتی خستبێتەسووچی ماڵانەوە، نەخێر، ئەوە ئیسلام بـوو ژن و پیـاوی لـەزۆرداریی ڕزگـار کـردو نـاوی ئـافرەت وەك گێـڕەرەوەی فەرموودەو شەرعناس و زانا لەمێژوودا تۆمـار بـوو، پیـاوی ئەرکدار کرد بژێویی ژیانی بۆ دابین بکـات و بـۆ بـژێویی پەیداکردن ئـافرەت ناچار نەکرێ لەماڵ بکرێتە دەرەوە، جا ئۆزۆن هاتووە چی تاوانێك بەرانبەر بەئافرەت دەکرێ لەئەورووپاو شوێنانی تر لەبابـەت کـرێ و ژیـانی تــر هــاتووە خســتوویەتییە گــەردنی ئیسـلامەوە، بــەڵام ئافرەتـانی موسـڵمان لـەوە ژیرتـرن بـەوەها قسـەیەك بـاوەڕ بکـەن، مرۆڤـە تاوانبارەکـانی ئێمـەی موسـڵمانیش بـەوەها تۆمـەتێك بـاوەڕ ناکات.

لەلاپـەڕە(٢٣٧)نەسـکی حەوتـەم(بوخاری و چـەردەیەکی دژ)هەیـە، پڕوپاگەندەی کردووە کە فەرموودەی دژ لەبوخاریدا هـەن و ئەیـەوێ هەنـدێکی بخاتـەڕوو! هــەروەك دەڵــێ دژ یــەکیی تریشــی هەیــە لەواتاکـەی یـان شـێوازی گواسـتنەوەی و هتـد، بـەڵام نەشـارەزایە بەزانســـتەکانی فـــەرموودە، کـــە دەکـــرێ زیـــاد لـــەجارێك داوای ڕوونکردنــــەوەی حوکمێــــك لەپەیامبــــەری ئــــازیز(صــــلی الله علیــــه وســــلم)کرابێ و ئــــەویش حوکمەکــــەی ڕوون کردبێتــــەوە، یــــان بەئیسـنادەکان و شـێوازی گێڕانـەوەکان لەهەنـدێ لـەفزدا جیـاوازیی هەبێ و گشتیی یەك واتا بگەیەنێ، هەر کەسێکیش زانیاریی زۆرتری

دەویّ بـــا بڕوانیّتـــە کتیّبـــەکانی زانســـتەکانی فـــەرموودەو بـــزانن فەرموودەناسان چـی کاریّکیـان کـردووە، بـەکورتی دوو جـۆری زۆر گرنگیان ڕاپەڕاندووە، یەکەم: پیاوەکانی نێو گێڕانەوەکە چۆن بوونە لـەڕووی سەرڕاسـتی و متمانـەو ئەزبـەردەکردن و بـیرو فامییانـەوەو هەروەها لەیەکتر دابڕاون یان نـە ، دووەم: نـاوەڕۆکی فەرموودەکـە چۆنە، دژیی و ناچوونییەکیی تێدایە یاخود نە، بەزۆر بواری تـریش کە لێرەدا جێگەیان نابێتەوەو قسەکەی زەکەریا ئـۆزۆن پـووچ و بـیّ مایە ئەکەن.

بابەتی کۆیلایەتیی وەکو خۆیشی وتوویەتی بابەتی ئیسـلام نـەبووە، لـەدێر زەمـان و لای جولەکـەو نەتـەوەکانی تـر کۆیلایـەتیی هـەبووە ئیسلام هاتووە دۆخەکەی بـۆ چاککردووەو ڕێـی خـۆش کـردووە بـۆ ڕزگار بوونی لەڕێی ئەوەی پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ئامۆژگاریی بـاوەڕدارانی کـردووە بەکچـەکەم یـان کوڕەکـەم بانگیـان لـیّ بکـەن، لەخواردنی خۆتان و بەرگی خۆتانیان پیّ بدەن، سـتەمیان بەرانبـەر نەکـــەن، لەکـــەفارەتی زیهـــارو ســـوێنددا لەبەنـــدە ڕزگـــار بکـــەن، نووسراوی سەربەستکردنیان لەگەڵدا ئیمزا بکەن، پـارەی زەکاتیـان پیّ بدەن تا بتوانن بـەو پارەیـە خۆیـان بکڕنـەوەو چـەند شـێوازێکی تریش کە شۆڕشـێکی ئاشـتییانەی کۆمەڵایـەتیی بـووە دەوڵەمەنـدو دەسترۆیشـــتووەکان بـــەباوەڕی ئیســـلامەتییەوە بـــەئازادکردنی کۆیلەکانیان هەوڵی ڕەزامەندیی خوای گەورەیان داوە.

لەبابــەت هــەردوو فــەرموودەدا نەفامانــە لێکدانــەوەی کــردووە، پەیامبەر(صلى الله عليه وسلم)ئەفەرموويێت:((نِعْمَ مَا لِأَحَدِهِمْ يُحْسِنُ عِبَادَةَ رِبِّهِ وَيَنْصَحُ لِسَيِّدِهِ، واتــا: باشــترین کەسـێکی ئــەوان ئەوەیــە جــوان خــوا بپەرســتیٚ و دڵســۆز بــیٚ بــۆ گەورەکــەی. یــاخود ئەفــەرموويێت:((للعبد المملوك الصالح أجران والذي نفس أبي هُرَيرة بيده لولا الحج والجهاد ما باليت ألا أموت إلاّ مملوكا، واتــا: بەنــدەی باش دوو پاداشتی گەورەی هەیە، سوێند بــەو کەســەی گیــانی منــی بەدەســتە، ئەگــەر جیهــادی ڕێگــەی خــواو چــاکەی دایکــم نەبوایــە، حەزمدەکرد کاتێك بمرم بەندە بوایەم.

زەکەریا ئۆزۆن شتەکانی تێکەڵکردووە، ڕەخنــە دەگــریٚ کــە دەقێــك نــەهاتووە ڕێگریــی لەکۆیلایــەتیی بکــات و چــەندین دەق هــاتووە هەڕەشە ئەدەن لەو کەسانەی لەکاتی میزدا خۆیان پاك ڕاناگرن یــان لەدەستنوێژدا قووله پێیان ناشۆرن. لا٢٣٩.

یەکەم ئەبیٚ ئەوە بزانین، خۆنەپاراستن لەبەرکــەوتنی میــز بەلاشــەو بــەرگ و قوولــە پــیٚ نەشــۆردن تایبەتــە بەنوێــژەوە، نوێــژێك قبوڵــە لاشەو بــەرگ و شــوێنی نوێژەکــە پــاك بــیٚ، ئینجا دەق نــەهاتن بــۆ قەدەغــەکردنی کۆیلــە، خــۆ لــەگێلیی دانــە ئــەو هــەموو ڕێوشــوێنانە نەبینی کە ئیسلام گرتوویەتییە بەر بۆ بەرتەسکردنەوەی حاڵەتەکــە، زەکــەریا ئــۆزۆن خۆیشــی بــاش دەزانــیٚ بەشــێکی کۆمەڵگــەی ئــەو سەردەمانەو ئەمریکاش تــا چــەند ســەدەیەکی نزیــك لەئێســتا کۆیلــە بەشێك بووە لەماڵ و سامانی خەڵك، ئێســتاش مافیاکــانی ئــەمریکاو

ئـەورووپا کۆیلایـەتیی بەمرۆڤـەوە دەکـەن و ژنـان ناچـار ئەکـەن لەبەرانبەر پارەو هەرەشەدا ببنە داوێن پیس و پیاوان ناچار ئەکـەن لەپـەنای کۆیلایەتییـدا هاوڕەگـەزبازیی هەڵبـژێرن و شـوو بەگـەورەو سەروو کاری خۆی بکات، بەڵام ئۆرژۆن و هاوبیرەکانی هەوڵ و کـاری ئیسلام نابینن و چاویان بیلالی حەبەشیی و کۆیلەکانی تر نابینێ کـە لەمێژووی ئیسلامدا ڕۆڵـی کاریگـەریان هـەبووە. ئـەبو هـورەیرە لـەم فەرموودەیـەدا هانمـان نـادات بـۆ کۆیلایـەتیی وەك ئـۆرژۆن ئـەیڵێ: نـەخێر، پەیامبـەری خـوا(صـلی الله علیـه وسـلم)لەبەرانبـەر ئـەو چاکەیەی گەورە بۆ بەندەکەی دەیکات، داوا ئەکات ئەمانیش هـەمان چـاکەی بدەنـەوە، بـۆ هـەموو کـارێکیش مـرۆڤ ئـەبێ کـاری خـۆی بەچاکیی ئەنجام بدات. ئەمە هاندانی بەنـدە بـووە کـە مرۆڤێـك خـوا پەرست بێ لەخزمەت ئەو کەسەشدا دڵسۆزە کـە ژیـانی بـۆ مسـۆگەر ئەکات و وەك منداڵی خۆی دایدەنێ و ڕاسـتگۆییانە ئـەبێ لەگەڵیـدا، فەرموودەی دووەمیش دڵدانەوەی کۆیلەکانە کـە چـەندە پاداشـتیان هەیـە لای خـواو بـەم فەرمایشـتە کـار دەکاتەسـەر دەوڵەمەنـدەکان تاوەکو باشتر بن لەگەڵیانـداو ئازادیـان بکـەن و هـیچ دژیەکییـەکیش لەمەدا نابینرێ، بەو مەرجەی تێبگەیت ئەڵقەی گەیەنەری نێوان دوو فەرموودەکـە چـییەو بەشـەکانی تریـی تایبـەت بـەم بابەتـەش بخوێنیتەوەو لەکۆی هەموویدا بەحیکمەتەکـەی ئەگـەی نـەك قسـەی ئاوەژووکراوی زەکەریا ئۆرژۆن.

لەلاپەڕە(٢٤٠)دا ئەم فەرموودەیەی هێناوەتەوە:«مِنْ قَذَفَ مَمْلُوكَهُ وَهُوَ بَرِيءٌ مِمَّا يَقُولُ جُلِدَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَّا أَنْ يَكُونَ كَمَا قَالَ»، واتـا: هەرکەسێ بوختان بەکۆیلەکەیدا بکات و کوێلەکە بێ تاوان بێ، ئەوە گەورەکـەی لەقیامەتـدا جەڵـد دەکـرێ. ڕەخنـە دەگـرێ بـۆ تۆڵـەی بوختانەکە لەدونیادا لەو گەورەیە ناکرێتەوە؟

وەڵام: بابەتی تۆمەتبارکردن بەداوێن پیسیی چەند لایـەنێکی هەیـە، ئەگەر مرۆڤێك پیاوێك یان ژنێکی بەئەنجامدانی کـاری داوێـن پیسیی تۆمەتبار کـرد دەبـێ بەخۆیـەوە بگەنـە چـوار شایەتی سەرڕاسـت و بینینی تەواوی کارەکە، ئەگەر نا سـەد جەڵدی لـێ دەدرێ، بـەڵام ئەگەر کەسەکە کۆیلە بوو ئـەم تۆمەتـەی وت و شـایەتی تـری نـەبوو بەخۆیەوە بکەنـە چـوار شـایەت، ئـەوە پـەنجا جەڵدی لـێ دەدرێ، واتا: جەڵدی ئەو بەنیوەیە.

ئەگەر ئەو کەسەی تۆمەتکار بـوو بـاوك بـوو، ئـەمیش جەڵـد نـاکرێ، لەئەگـەری ڕاسـت نەبوونـدا لای خـوا هەڕەشـەی لەسـەر هەیـە کـە ویستوویەتی منداڵی خۆی نابووت بکات.

ئەگـەر تۆمەتکارەکـە مێـرد بـوو ژنەکـەی خـۆی بـەداوێن پیسـیی تۆمەتبار کرد پێویستی بەسێ شایەتی تر نییە، چـونکە مێردێتـی و چوار جار سـوێند ئـەخوات کـە ژنەکـەی لـەداوێن پیسـییدا بینیـوەو لەپێنجەمدا دەڵێ: نەفرەتی خوام لێ بێ ئەگەر لەم تۆمەتبارکردنـەدا ڕاستگۆ نەبم، ژنەکەش چوار سوێند ئەخوات کە کاری لەو شێوەیەی نەکردووەو لەپێنجەمدا دەڵێ: نەفرەتی خوام لێ بێ ئەگـەر ئـەو لـەو

قسەیەدا ڕاستگۆبوو. ئەمە پێیدەوترێ(لعان)، گەورەکەش لێرەدا لەجێی باوك و سەرپەرشتیارە، عەیبداربوونی کۆیلەکەی عەیبەیە بۆ ئەم، بەلاّم ئەگەر ڕاستگۆ نەبوو ئەوە سزای قیامەتی بۆ هەیەو ترساندنی گەورەکانە بەخۆڕایی کۆیلەکانیان تۆمەتبار نەکەن، کە ئەمەش لەخودی خۆیدا دەگمەن ڕوویداوە.

ئینجا لەبابەت مەسخ بووندا تانە ئەدات، ئێمە وەك موسڵمان باوەڕمان بەشتە پەنهانەکان هەیە کە تەنیا خوای گەورە دەیانزانێ و لەڕێگەی پەیامبەرەکەیەوە هەندێ شت لەو بارەیەوە بەئێمە گەیشتووەو دوابڕاو کردنیش تایبەت بووە بەو کۆمەڵە کەسەوە، مەسخکردنیش بۆ خۆی دوابڕکراوییە، لەمرۆڤەوە خوای گەورە کردبێتی بەمەیمون و بەرازو هیچ ڕێگرییەك بەرانبەر بەویستی خوا نەبووە و نابێ.

لەبەهەشتیشدا شتی وەها هەیە نە چاو بینیوێتی نە زمان گوێی لێ بووە و نە بەبیری مرۆڤیشدا هاتووە، تەنیا ئەو مرۆڤانە لەم موژدەیە بەگومانن کە باوەڕدار نین و بەباوەڕ ڕێزدار نەبوونە، خوای گەورە کە لەم ژیانەدا ئەو هەموو شتەی بۆ مرۆڤ ڕامهێنابێ بۆ باوەڕدارو بێ باوەڕ، چی گرانییەکی تێدایە بۆ باوەڕدارە سەرڕاستکانی ڕامیبهێنێ لەئاخیرەتدا.

**وشەی(مرحبا)ی** لاپەرە ٢٤٩ بەڕۆژ باش وەرگێڕدراوە کە لەڕاستییدا وەها نییە، ڕۆژ باش(صباح الخیر)ە، بەڵکو سلاّو ئەگەیەنێ و قسە

زۆره لەسەر ئەو وشەیە. لەبابەت هاتنی جیبریل(علیه السلام)بۆ لای پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)، زەکەریا ئۆزتۆن تێکەڵ و پێکەڵیی زۆری کردووه، پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)لەگێڕانەوەکانی سەبارەت بەئیسراو میعراج لەشوێنی وەهادا هەبووه تەواوی ڕووداوەکەی بۆ هاوەڵانی گێڕاوەتەوە، لەشوێنی وەهاشدا هەبووه تەنیا ئەوەی گێڕاوەتەوە کە مەبەست بووه، ڕووی گێڕانەوەی هاوەڵان و گێڕەرەوانیش دژیەکییان تێدا نییە، کێشە لەوەدا نییە جارێك جیبریل باسکراوەو لەفەرموودەی تردا بەس وتراوه فریشتە. جیبریل فریشتەیە، ڕووی گرنگیی گێڕانەوەکە لەوەدایە پەیامبەری خوا سنگی شەقکراوەو دانایی و ئیمانی خراوەتە ناوی. ئینجا ئەوەی موسا بەپەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)ئەفەرمووێت بگەڕێرەوە لای پەروەردگارو تکا بکە لەپەنجا نوێژەکە کەم بکاتەوە، چونکە بۆ ئوممەتەکەت گرانە لەڕۆژێکدا پەنجا فەرز ئەنجام بدەن و پەیامبەریش هەرجارەو دەگەڕێتەوە تا دەکرێتە پێنج فەرز، واتای ئەوە نییە خوا لەموسای باشتر نەزانی بێ، نەخێر حاشا ئەگەر فەرموودەکە ئەوەی لێ بفامرێ وەك ئۆزتۆن لێی فامیوە، ئەمە نرخ و پێگەی پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)لای خوا پیشان ئەدات کە ڕێزی لێ ئەنێ و پەنجا فەرزی بۆ دەکاتە پێنج فەرزو پاداشتی پەنجا فەرزەکەی بۆ دەهێڵێتەوە، جا ئۆزتۆن لەبەرئەوەی باوەڕی بەپیرۆزیی فەرموودە نییەو بەبێ فەرموودەش نازانێ نوێژ چۆن

ئــەنجام دەدرێ، لەگــەورەیی پێــنج فــەرزەی نوێــژ و پاداشــتە گەورەکەی تێناگات و ناچارە ئەم قسانە بلێ.

لەلاپــەڕە(٢٥٥) فــەرموودی شــەفاعەتی هێناوەتــەوە کــە ئەمــە دەقەکەیەتی: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو حَيَّانَ، قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو زُرْعَةَ بْنُ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِلَحْمٍ، فَدُفِعَ إِلَيْهِ الذِّرَاعُ، وَكَانَتْ تُعْجِبُهُ، فَنَهَسَ مِنْهَا نَهْسَةً، ثُمَّ قَالَ: " أَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَهَلْ تَدْرُونَ لِمَ ذَلِكَ؟ يَجْمَعُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، يُسْمِعُهُمُ الدَّاعِي، وَيَنْفُذُهُمُ [ص:٣٨٥] الْبَصَرُ، وَتَدْنُو الشَّمْسُ فَيَبْلُغُ النَّاسَ مِنَ الْغَمِّ وَالْكَرْبِ مَا لَا يُطِيقُونَ، وَلَا يَحْتَمِلُونَ، فَيَقُولُ بَعْضُ النَّاسِ لِبَعْضٍ: أَلَا تَرَوْنَ إِلَى مَا أَنْتُمْ فِيهِ؟ مَا قَدْ بَلَغَكُمْ؟ أَلَا تَنْظُرُونَ مَنْ يَشْفَعُ لَكُمْ إِلَى رَبِّكُمْ عَزَّ وَجَلَّ؟ فَيَقُولُ بَعْضُ النَّاسِ لِبَعْضٍ: أَبُوكُمْ آدَمُ، فَيَأْتُونَ آدَمَ، فَيَقُولُونَ: يَا آدَمُ، أَنْتَ أَبُو الْبَشَرِ، خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ، وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، وَأَمَرَ الْمَلَائِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ، فَاشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ: آدَمُ عَلَيْهِ السَّلَامُ: إِنَّ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ نَهَانِي عَنِ الشَّجَرَةِ فَعَصَيْتُهُ، نَفْسِي نَفْسِي، نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي اذْهَبُوا إِلَى نُوحٍ، فَيَأْتُونَ نُوحًا، فَيَقُولُونَ: يَا نُوحُ، أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى أَهْلِ الْأَرْضِ، وَسَمَّاكَ اللَّهُ عَبْدًا شَكُورًا، فَاشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ نُوحٌ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ

غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ [ص:٣٨٦]، وَإِنَّهُ كَانَتْ لِي دَعْوَةٌ عَلَى قَوْمِي، نَفْسِي نَفْسِي، نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى إِبْرَاهِيمَ. فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ فَيَقُولُونَ: يَا إِبْرَاهِيمُ، أَنْتَ نَبِيُّ اللَّهِ وَخَلِيلُهُ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ إِبْرَاهِيمُ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ فَذَكَرَ كَذِبَاتِهِ، نَفْسِي نَفْسِي، نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى مُوسَى، فَيَأْتُونَ مُوسَى، فَيَقُولُونَ: يَا مُوسَى، أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِرِسَالَاتِهِ، وَبِتَكْلِيمِهِ عَلَى النَّاسِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ مُوسَى: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنِّي قَتَلْتُ نَفْسًا لَمْ أُومَرْ بِقَتْلِهَا، نَفْسِي نَفْسِي، نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى عِيسَى، فَيَأْتُونَ عِيسَى، فَيَقُولُونَ: يَا عِيسَى، أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ، وَرُوحٌ مِنْهُ، قَالَ: هَكَذَا هُوَ، وَكَلَّمْتَ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ، فَاشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ عِيسَى، إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ لَهُ ذَنْبًا [ص:٣٨٧]، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى مُحَمَّدٍ، فَيَأْتُونِي فَيَقُولُونَ: يَا مُحَمَّدُ، أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، وَخَاتَمُ الأَنْبِيَاءِ، غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ، وَمَا تَأَخَّرَ، فَاشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَأَقُومُ فَآتِي تَحْتَ الْعَرْشِ، فَأَقَعُ سَاجِدًا لِرَبِّي عَزَّ وَجَلَّ، ثُمَّ يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَيَّ وَيُلْهِمُنِي مِنْ مَحَامِدِهِ، وَحُسْنِ الثَّنَاءِ عَلَيْهِ، شَيْئًا لَمْ يَفْتَحْهُ عَلَى أَحَدٍ

قَبْلِي، فَيُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ، ارْفَعْ رَأْسَكَ، سَلْ تُعْطَهْ، اشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَقُولُ: يَا رِبِّ أُمَّتِي أُمَّتِي، يَا رِبِّ أُمَّتِي أُمَّتِي، يَا رِبِّ أُمَّتِي أُمَّتِي، يَا رِبِّ، فَيَقُولُ: يَا مُحَمَّدُ، أَدْخِلْ مِنْ أُمَّتِكَ مَنْ لَا حِسَابَ عَلَيْهِ مِنَ الْبَابِ الْأَيْمَنِ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ، وَهُمْ شُرَكَاءُ النَّاسِ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْأَبْوَابِ "، ثُمَّ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَمَا بَيْنَ مِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الْجَنَّةِ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَهَجَرَ، أَوْ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَبُصْرَى».

کورتــەی باســەکە ئەوەیــە ڕۆژێــك باڵــە گۆشــتێك بــۆ پەیامبــەری خوا(صلی الله علیه وسلم)دەهێنن و گازێکی لێ ئەگرێ و باســی ڕۆژی قیامــەتیان بـۆ ئــەکات کــە گــەورەی ئــەو ڕۆژەیــەو خەڵکەکــە پــەنا دەبەنەبــەر ئــادەم و نــوح و ئیــبراهیم و موســاو عیســاو هەنــدێ پەیامبەری تر تاوەکو لای خـوای گـەورە تکـا بکـەن بەهەشـتییەکان بخرێنــە بەهەشــت و دۆزەخییــەکان بــۆ دۆزەخ و لەچــاوەڕوانیی ڕزگاریان بێ، ئەو پەیامبەرانەش هەریەکەو بەهۆی کارێکەوە کـە لای ئەوان گەورەیە دەست بەڕووی خەڵکەکەوە دەنێن و خەمی خۆیانیان هەیــەو خەڵکەکــە ڕەوانــە ئەکەنــە لای پەیامبــەری ئیســلام موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)، ترسی ئادەم و نـوح و ئیـبراهیم و موسـا باسـکراوەو ئــەوەی عیسـا بـاس نــەکراوە ســەلامی خوایـان لەسەربێ و بووەتە گرێی دەروونیی نووسەر!

جا پێویستە سەرەتا شتێك ڕوون بکەمەوە، وشــەی(نهسة) بــەواتای گــازگرتن دێــت، کەســێك بەددانــەکانی پێشــەوەی گــاز لەشــتێك بگرێ(لسان العرب)، بەلام وەرگێڕانێکی زۆر بێ ئەدەبییانە کراوە کــە

ناکریٚ بەئەنقەست نەزانریٚ، یان کاری وەرگیٚڕە یان ئەو کەسەی پیٚیداچـــــووەتەوە یـــــان بەرێککـــــەوتنی هەردووکیانـــــە، لەلاپەڕە(٢٦١)دەڵیٚ: ئەم فەرموودەیە لەگەڵ وەسفی قەپالگرتنی پیٚغەمبەر..... منداڵیٚکیش عەقڵی بەوە دەشکیٚ قەپالگرتن هی مرۆڤ نییە، بەئەنقەست ئەم وشەیە دانراوە، مامۆستا هەژار لە(هەمبانە بۆرینە)دا دەڵیٚ: قەپاڵە: پچڕینی پڕ بەدەم و گازلیٚدانی پڕ بەدەمە. ئەم وشەیە بۆ ئاژەڵ و هەندیٚجاریش بۆ مرۆڤی بیٚ ڕیٚز ئەوتریٚ، ئەمەش وەك وشەی کەوتن کە بەرانبەری پەیامبەر بەکارهاتووە لەم کتیٚبەدا، پەلاماریٚکی ڕوونە لەپاڵ پەلاماردانەکانی تردا.

**ئینجا زەکەریا ئۆزۆن دەڵیٚ:** تووڕەیی خوا لەعیسای کوڕی مەریەم دیار نییە و بیٚهودەیە! لا٢٦١.

ئەوەی کە وتراوە- وَلَمْ يَذْكُرْ لَهُ ذَنْبًا - لەزانستی فەرموودەدا پیٚیدەوتریٚ(إدراج - تیٚهەڵکیٚش)، ڕافەی گیٚڕەرەوەیە، بەڵام ئۆزۆنی نەزان بەزانستی فەرموودە چی لەم بابەتە دەزانیٚ. پاشان ئەوەی پەیامبەران و عیساش(سەلامی خوایان لەسەربیٚ)خۆیان بەدوور دەگرن لەتکاکاریی و هەریەکەو بەخودی خۆیەوە سەرقاڵەو باسی هەڵەی خۆی دەکات، تانە نییە لەسەر ئەو پەیامبەرە مەزنانە، بەڵکو بەلای پەیامبەرانەوە هەڵەیەکی سادەو سووکیش کە تاوانی خۆیانیشی تیٚدا نەبیٚ بەکەم تەماشا ناکریٚ، ئەوەی کە عیسای کوڕی مەریەم(سەلامی خوا لەخۆی و دایکی بیٚ)لەتووڕەیی خوا خۆی بەدوور دەگریٚ ڕەنگە بۆ ئەم هۆیە بگەڕیٚتەوە کە خەڵکانی دوای

خۆی پەیامەکەیان گۆڕی و کردیانە خواو کوڕی خواو ئەمەش بەزمانی مەسیحەوە هەڵبەست، وەك پەروەردگار ئەفەرمووێت: ﴿ وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ ﴾ المائدة: ١١٦- ١١٧، واتا: بیربکەرەوە کاتێ لە ڕۆژی دواییدا خوا دەفەرمووێ ئەی عیسای کوڕی مەریەم ئایا تۆ وتووتە بە خەڵکی کە من و دایکم بە دوو پەرستراو دابنێن و (بمان پەرستن) لە جیاتی خوا ؟ عیسا وتی : پاك و بێگەردی بۆ تۆ ئەی خوایە نابێ و ناگونجێ من بۆ شتێك بڵێم کە بە هیچ شێوەیەك ماف من نی یە ، من ئەگەر ئەو قسەیەم کردبێ بەڕاستی تۆ ئاگات لێ یە ، چونکە تۆ ئەوەی لە دڵمایە دەیزانی بەڵام من نازانم و بێ ئاگام لەو نهێنییەی کە لای تۆیە بەڕاستی تەنها تۆ زانای تەواوی بە هەموو نهێنییەك. هیچم پێ نەوتوون بێجگە لەوە نەبێت کە تۆ فەرمانت پێداوم کە بەندایەتی خوا بکەن کە پەروەردگاری من و ئێوەیشە و من شایەت و چاودێر بووم بە سەریانەوە تا لەناویاندا بووم ئینجا کاتێ تۆ منت بردەوە بەرزت

کردمەوە بۆ ئاسمان هەر خۆت چاودێر بووی بەسەریانەوە، وە خۆت ئاگادار و شایەتی بەسەر هەموو شتێکەوە.

**ئینجا لەلاپەڕە(٢٦٢)دا** بەتەنزەوە قسە لەسەر ئەم فەرمایشتەی پەیامبەری مەزن موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)ئەکات: «إِذَا تَنَخَّمَ أَحَدُكُمْ، فَلَا يَتَنَخَّمَنَّ قِبَلَ وَجْهِهِ، وَلَا عَنْ يَمِينِهِ، وَلْيَبْزُقْ عَنْ شِمَالِهِ، أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ الْيُسْرَى»، کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)بەڵغەمێکی(یان تف و هەرشتێك لەسنگەوە دەریچێ) بەدیواری مزگەوتەوە بینی بەبەردێکی بچووك کڕاندی و فەرمووی: گەر یەکێکتان ویستی بەڵغەم و شتێکی وەها لەدەمی فڕێ بدات با نەیکاتە پێشی خۆی و ڕاستیشی، با بیکاتەلای چەپی یان ژێر قاچی چەپیێ. قسە لەسەر ئەوە ئەکات لەمڕۆدا کە فەرش و دیواری کاشی هەیەو تف بکەینەسەریان و دواتر بیکرێنین و زیندووی بکەینەوە، ئەمە بۆ ئەوانە جێبەجێ دەبن کە دیواریان قوڕە! ئەمە قسەی زەکەریا ئۆزۆنە، مرۆڤێك ئەگەر ئەدەب و جوامێریی هەبێ ئاوەها لەگەڵ فەرموودەدا مامەڵە ناکات، یەکەمجار ئەوە ڕوونە وشەی(ئەگەر)بەکارهاتووە و هەندێجار مرۆڤ ناتوانێ بەڵغەم یان شتی تر لەقووڕگەوە دەریچێ ڕابگرێ و پەیامبەریش(صلی الله علیه وسلم)موسڵمانان ڕادەهێنێ لەسەر پاکیی و جوانی، مەبەست ئەوە نییە لەمڕۆدا تف و بەڵغەم بکەیتە دیواری کاشییەوە، چونکە فەرموودەی ترمان هەیە و نووسەر لەئاستیدا نابینابووە، هەر

پەیامبەری خوایە(صلى الله عليه وسلم)ئەفەرمووێت:«البزاق في المسجد خطيئة وكفارتها دفنها»، واتا: تفکردن لەمزگەوت تاوانەو کەفارەتی تاوانەکەش سڕینەوەو نەهێشتنێتی بەپێ هێنان بەسەریدا. ئەمە بۆ حەوشەی مزگەوت چ جای حەرەمەکەی و ئێستاش لەزۆربەی مزگەوتی موسڵمانان حەوزو شوێنی دەستنوێژ شۆردن و ئاو لەلووت و دەم ڕادان هەیە، ئیسلامیش ڕەچاوی دۆخی قووڕنشین و شوێنە هەژارەکانیشی کردووە ئەگەرچی زەکەریا ئۆزۆن خۆی لەئاستیان گەورە ئەبینێت!

ئیمامی بوخاری و زانایانی تر ئەوەیان لەسەر خۆیان پێویست کردووە فەرموودەکە بگێڕنەوە بەدڵی ئۆزۆن بێ یاخود نە، بۆ جاران بووبێ یان ئێستا، خوێنەریش لەکاتی خوێندنەوەی ئەم فەرموودەیەدا نمونەی بەرچاویی هەیە لەوەی جارێك لەجاران بینیوێتی کەسێك لەحەوشەی مزگەوتدا تفی فڕێ داوەو مرۆڤ بێزی لێ هاتووەتەوە، ڕەنگە تفی ئەو مرۆڤانەش بێ کە خوا ناناسن و ناچار بۆ ئاودەستکردنەوە پەنایان بردبێتە بەر مزگەوت، بەڵام لەبەرئەوەی لەجوانیی و پاکیی ئەم دینە تێنگەیشتوون بۆیە تفەکەیان بەو شێوەیە بەجێهێشتووە، چونکە شوێنی دەستنوێژی موسڵمانانیان شارەزا نییە!

ئینجا ڕەخنە دەگرێ لەو فەرموودەیەی کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)دەفەرمووێ: ئەگەر مێش کەوتە ناو قاپ و مەنجەڵی خواردنتانەوە لەنێو قاپەکەدا مێشەکە نوقم بکەن و ئینجا فڕێی

بدەنــە دەرەوە، لەیــەکێك لەباڵــەکانی شــیفا هەیــەو لــەوی تــریش نەخۆشیی. یەکـەمجار ئـەم فەرموودەیـە ڕێنماییـە بەموسـڵمانان کـە بەئەنجامدانی ئەو کارە زیانی ناهێڵی، دووەمیش ئەمە فـەرمان نییـە تـا ناچار بکرێـی هـەر دەبێ لێیبخۆی، بـەڵکو بەرچـاو ڕوونکردنـی موسڵمانانەو زانستی نوێیش ئەمە بەڕاست دەزانێ.

ڕەخنە لەم فەرموودەیە ئەگرێ: «إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا، فَلَا يَمْسَحْ يَدَهُ، حَتَّى يَلْعَقَهَا أَوْ يُلْعِقَهَا»، واتا: ئەگەر یەکێك لەئێوە نانی خـوارد بـا دەسـتی نەسـڕێ، بـەزمانی دەسـتی بلیسـێنێتەوە، یـان یـەکێك ئەوەی بۆ بکات. سەرەتا دەبێ ئەوە بزانین مەبەست بەدەسـت سـێ پەنجەیە وەك ئیبن عەباس باسی ئەکات و بەسێ پەنجە تیکە ئەکرێ نــەك بەهــەموو دەســت، ئینجــا لای ئیســلام خــواردن بەرەکەتــە و پەیامبەری خواش(صلی الله علیه وسلم)لەمەدا ڕاماندەهێنێ ئەوەندە لــێ بنــێین بخورێــت و وەك بەرەکــەت و شــیفا بڕوانینــە خــواردن و بەشـوێن بەرەکەتەکەیـەوە بـین کـە ڕەنگـە کۆتاییەکـەی بـێ، ئـەم فەرموودەیــەی لەبیرچــووەتەوە کــە پەیامبــەر(صــلی الله علیــه وســلم)ئەفەرمووێ: " وَلَا يَرْفَعِ الصَّحْفَةَ حَتَّى يَلْعَقَهَا أَوْ يُلْعِقَهَا، فَإِنَّ آخِرَ الطَّعَامِ فِيهِ الْبَرَكَةُ "، واتا:کــە لــەخواردن بوونــەوە قاپەکــە هەڵمــەگرن، بــەڵکو بنەکــەی بلیســێننەوە، چــونکە لــەکۆتایی خواردنەکەدا بەرەکەت هەیە.

ئینجا ڕەخنە ئەگرێ لەو فەرموودەیەی کە دایکـە عائیشـە(خوای لـێ ڕازی بێ)ئەیگێڕێتــەوە، کــە کۆمەڵــە ئەعرابییــەك هاتنــەلای

پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)و وتیان:کەی قیامەت دێت؟ ئەویش ڕوانیە منداڵترینیان و فەرمووی:ئەگەر ئەمە بژیَ پیر نابیَ ئێوە قیامەتتان هاتووە، پێی وایە بوخاریی بەهەڵەدا چووە ئەگەر مەبەستی بوویێ قیامەتی هەموو خەڵك بیَ بەم فەرموودەیە. بەڵام ئۆزتۆن ئەوەی بیرچووەتەوە کە بوخاریی و زانایانی تر چۆن باسی قیامەتی گەورەیان کردووە بەهێنانەوەی دەقی فەرموودە، ئەمە ئامۆژگاریی دانە بەخەڵك کە تەنیا کۆتا هاتنی دونیا جێی ترس و ناخۆشیی نییە، بەڵکو مردنی هەریەکەمان قیامەتێکە بۆ خودی خۆمان و دەبیَ هەمیشە لەچاوەڕوانیدا بین بەکردنی کاری باش و قسەی باش و لەسەرووی هەموویەوە نییەتی باش و جوان نەك گومانی دووڕوو و بیَ باوەڕان.

ئینجا فەرموودەکەی لاپەڕە(٢٦٧)ی هێناوەتەوە کە پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)لەوەڵامی هاوەڵێکدا کە لێی ئەپرسیَ لەنێو دەفری ئەواندا(ئەهلی کیتاب) شت بخوات، دەفەرمووێ دەفرو قاپەکانیان بشۆرن ئینجا شتی تێدا بخۆن. زەکەریا ئۆزتۆن بەتەنزەوە دەڵیَ:ئەم فەرموودەیە لەمڕۆدا جێبەجیَ بکەین؟! چی لەو هەموو خواردنگەو هۆتێلانە بکەین کە بەهەموو دونیادا بڵاوبوونەتەوە لەدەرەوەی سنووری وڵاتە ئسلامییەکان؟ ئایە خۆمان داوای ئەوە بکەین خۆمان قاپەکە بشۆرین؟

بۆ هەموو ئەم تەنزەی ئۆزێن وەڵام هەیە، یەك: ئەوانەی ئەهلی کیتابی شام عەرەب بوون و ببوونە گاور(ئەهلی کیتاب)، دوویش: مەبەست بەهەموو دەفرێك نییە، زانایان ڕوونکردنەوەیان لەوەدا هەیە، پەیامبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)نانی ئەهلی کیتابی خواردووە، بەڵکو لەم فەرموودەیەدا مەبەست و حیکمەتێك هەیە نمونەکانی ئۆزێن نایبینن، پێشەوا نەوەوی دەڵێ: مەبەست بەو قاپ و دەفرانەیە کە بەرازیان تیادا لێ دەناو عەرەقیان لێ دەخواردەوە، لەبەر ئەمە بووە فرمانی داوە بیشۆرن ئینجا تیایدا خواردن لێ بنێن. زەکەریا ئۆزێن تەواو لێی شێواوە، بەڕەخنەگرتنی لەبوخاریی سەنتەری هۆشی لەدەست داوە، ئاخر کە جارێك شیعری بەکیم شوبهاندووە ئەو شیعرانەبووە کە خراپ و دوور لەڕەوشتن، هاندانی حەسسانیش بۆ شیعر وتن، بۆ ئەوەیە شیعرەکانی حەسسان بەرگریی بووە لەڕەوا، بەڕوانین بۆ بینینی جوبریل هیچ گومانێك لەوەدا نابینرێ، جاری وەها بووە لەوێنەی پیاوێکدا هاتووەو جارێکیش بەوێنەی ڕاستەقینەی خۆی لەئاسمان بینیویێتی، باشتر ئەبوو تەماشای جۆرەکانی هاتنی وەحی بکردبایە، زانایان لەهەموو کەس لێهاتووترن بۆ بینینی دژیەکی، دژیەکیان لەبوخارییدا نەبینیوە، هاتوون شیکردنەوەو حوکمیان لێ هەڵچنیوەو ئێمەش لەڕێگەی ئەو حوکم هەڵگۆزینەوە مامەڵە ئەکەین، چونکە هەر بوارێك شۆڕەسواری خۆی هەیە، ئەگەر وەها نەبووایە سەحیحی بوخاریی ڕاڤەی لەسەر نەدەنووسرایەوە.

**ئینجا هاتووه و دەڵێ**:بوخاریی ئەیەوێ بەم فەرموودەیە چیمان پێ بڵێ:((کنا نعزل والقران ینزل، ئێمە پێی دەڵێین: جابر ئەگێڕێتەوە کە لەوکاتەی قورئان دادەبەزی و حوکمەکانی پێمان دەگەیاند، لەئێمە هەبوو نزیکی جارییەکەی نەدەبوویەوە نەك سکپڕبێ، چونکە بەسکپڕبوونەکەی دەبووە(أم ولد)و بۆ ئەم دوورگرتنەشمان دەقی قورئانیی دانەبەزی و پەیامبەریش(صلی الله علیه وسلم)رێگرییمانی نەکرد.

**لەبەشی(نەسکی)هەشتەم** باس لەنێوان ئێستاو ڕابردوو ئەکات و ڕەخنە ئەگرێت کە بۆچی پەلامار دەدرێن کتێك ڕەخنە ئەگرن و بەخیانەتکار تۆمەتبار ئەکرێن. ڕەخنەگرتن جیاوازە لەڕوونکردنەوەو بەدوای ڕوونکردنەوەدا ڕۆیشتن، ئەم زەکەریا ئۆزۆنە لەسەرەتاوە تا کۆتایی بەئەنقەست کۆمەڵێك فەرموودەی هێناوەتەوە بێ ڕاڤەو لێکۆڵینەوەی زانایان و تێگەیشتنی پێشەوا و عەللامەکانی ئیسلام شەن و کەونی خۆی ئەکات و پەلامار ئەدات، پێیشی ناخۆشە بەخیانەتکار ناوزەدبکرێ، لەکاتێکدا وەرگرتنی فەرموودەیەك بەبێ لێکدانەوەی ناوەڕۆك و ئەو پرسیارەی فەرموودەکەی لەبارەوە وتراوە گەورەترین خیانەتە. خۆش لەوەدایە ئەیەوێ لەم بەشەدا هەندێ فەرموودە وەربگرێ و وەك پێشەوا شافیعیی لێکدانەوەیان بکات، ئەمە وەك تەحەدایەك بەرانبەر بەشافیعیی گەورە کە ئەم

بەتۆزی بەرِپێی شافیعیی مەزهەبێکیش ناگات چ جای خودی ئەو پێشەوایەو زاناکانی مەزهەبەکەی.

فەرموودەکەی ئەنەسی هێناوەتەوە کە دەڵێ: برایەکم هەبوو پێیدەوترا ئەبو عومەیرو لەشیر برِابوویەوە، باڵندەیەکی بچووکی هەبوو، پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)رەوشت بەرزو کەیف خۆش بوو هەرکاتێك بەلایدا تێپەرِ بووایە ئەیپرسی: ئەی ئەبا عومەیر باڵندە بچووکەکەت چی کرد و ئەبو عومەیری برام یاریی لەگەڵدا ئەکرد. زەکەریا ئۆزۆن لێرەدا خۆی لێمان کردووەتە باڵندە و پەلەوەر دۆست! و پشتی کردووە لەباسکردنی مەزنیی ئەو پەیامبەرە کە تا ئەو ئاستەی سادە ژیاوەو کاتی خۆی بەمنداڵانیش داوە و گفتوگۆی لەگەڵیاندا کردووەو رِێزی لێیان ناوە. زەکەریا رِەخنە دەگرێ بۆچی باڵندە بەدەست منداڵەوە بدرێ کە ئازاری ئەدات! یەکەم: مەرج نییە ئەبو عومەیر تازە لەشیر برِابێتەوەو ئەنەس(خوای لێ رِازی بێ)مەبەستی بووە بڵێ شیرە خۆر نەبووە، ئینجا ئەوە شتێکی سرووشتییە لەدێهات و شوێن گەلێکدا منداڵ کۆترو باڵندەی هەیە و یاریان لەگەڵدا ئەکات و زیانیشیان لێ نادات، بەلاّم لەبەرئەوەی نووسەر زۆر دەروون نەخۆشە، هاتووە بابەتەکەی بەبۆچوونی بەرتەسك و بێباوەرِیی خۆیدا لێکداوەتەوە.

ئینجا فەرموودەیەکی هێناوەتەوەو پوختەکەی ئەوەیە: لەماڵی پێنج یەك پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)هەندێ مەرِی بەعەلی(خوای لێ رِازی بێ)داوە تاوەکو بۆ هاوسەرگیریی فاتیمە(خوای لێ رِازی

بێ)سوودی لێ ببینێ هەروەها چەند وشترێکیش، کاتێک عەلی بەشوێن کابرایەکی بەنو قینوقاعدا دەچێ تا دەگەڕێتەوە ئەبینێ وشترەکانی سەر بڕدراون و ناوزگیان دەرهێنراوە، ئەپرسێ: ئەمە کێ وەهای کردووەو دەست دەداتە گریان، دەڵێن: حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب ئەمەی کردووەو لەفلانسە ماڵی ئەنسارن و سەرخۆشن، عەلی دەچێ پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)لەگەڵ خۆیدا دەبات و ئەبینێ سەرخۆشن، ئەمە لەپێش حەرامبوونی عەرەق بووە، کە پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەم دیمەنە ئەبینێ پشتاو پشت دەگەڕێتە دواوە.

زەکەریا ئۆزێن کۆمەڵێ هەڵهێنجانی کردووە کە زۆربەی بەنێوچاویدا دەدرێتەوە:

سەرەتا لەوەرگێڕانەکەدا ئەم گۆرانییە هاتووە: حەمزە ئادەی ئەو وشترانە......کەوان لەو حەوشەو کۆت لەپایانە.........تاوەکو لەجەرگیان دەبڕێ و دەیبا....لەڕاستیدا لەدەقە عەرەبییەکەدا بوونی نییە، نازانم چی هۆکار بووە تا بەو ڕادەیە ویستراوە لێکدانەوەکانی نووسەر خۆش بکرێ!

لەخاڵی(٧)دەڵێ: ڕەوایە بۆ وشتری سەربڕدراو بگری، بەلام گریان بۆ مردوو باش نییە.

وەلام: لەمەدا درۆت کرد، خودی پەیامبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)بۆ مردنی منداڵی خۆی گریاوەو لای هاوەلانیش ئاشکراو ڕوونە

و بەموتەواتیر بەئێمە گەیشتووە، بەڵکو نەهی کراوە لەقژڕنین و سنگ دادڕین و قسەی خراپ و لەخۆدان، ئەگەر بڕوانیتە(فتح الباری)دەبینی نووسراوە: ئاساییە مرۆڤ لەکاتی خەفەت و تووڕەییەك بەسەریدا زاڵ بێ بگری، بەتایبەت دەزانرێ کە عەلی(خوای لێ ڕازی بێ)ئەو ماڵەی بۆ زەماوەندی فاتیمە دانابوو.
ئینجا کە پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)گەڕایەوە دواوە زیاتری نەوتووە، لەبەرئەوە بووە مرۆڤ لەکاتی سەرخۆشیدا هیچ نافامێ.
لەگشتی گرنگتر ئەوەیە، ئەم ڕووداوە پێش حەرامبوونی عەرەقخواردنەوە بووە، جا کە ئەوکات حەرام نەبووبێ، دیارە حەددی ئەو کارەش بوونی نەبووە، دوای حەرامبوونەکە حەدد هاتووەتە ئاراوە بۆیە حەدد لەحەمزە نەدراوە نەك ئەوەی ئۆزۆن ئەیڵێ کە ئاساییە مامی فەرمانڕەوا سزا نەدرێ.
پڕوپاگەندە ئەکات بەتەنز ئامێزەوە کە ناکرێ مامی پێشەوا غەرامە بکرێ، ئیبن حەجەر عەسقەلانی لە(الفتح)دا دەڵێ: ئیبن ئەبی شەیبە گێڕاویەتییەوە لەئەبی بەکری کوڕی عەیاشەوە کە پەیامبەر(صلی الله علیه وسلم)بەپارەی دوو وشتر غەرامەی حەمزەی مامی کردووە.

لەلاپەڕە(٢٨١)نووسەر ئەپرسێ: بۆ سنوورەکانی خوا بەسەر حەمزەدا جێبەجێ نەکرا؟!
وەڵام: پێشتر وتمان و نووسەریش خۆی پێشتر ئەمەی وتووە، کە ئەم ڕووداوە پێش حەرامبوونی عەرەقخواردنەوە بووە، کاتێك حەدد

ئەنجامدراوە کە عەرەق حەرامکرابێ، ئەی کە تائەوکات عەرەق حەرام نەکرابێ چۆن سزا بوونی دەبێ؟ بەڕاستی پرسیارەکەی نەزانیی ئەو دەردەخات.

ئینجا تۆمەت ئەخاتەپاڵ پێشەوای سێیەمی خەلیفەی ڕاشیدیی عوسمانی کوڕی عەفان(خوای لێ ڕازی بێ)کە پێنج یەکی دەسکەوتەکانی ئەفریقیای بەزاواکەی خۆی داوە(مەروانی کوڕی حەکەم)، تۆمەتی ئەبو موخنەف و ئەمیش جارێکی تر جواوێتییەوەو لێکۆڵینەوەی نەکردووە، لەلاپەڕەکانی تردا وتمان پێشەوا تەبەریی بەشێکی گێڕانەوەکانی لەئەبو موخنەفەوەیەو ئامازەشی پێ داوە تاوەکو نەکەوینە داوی ژەهرەکانییەوە.

ڕاستیی بابەتەکە بەجۆرێکی ترە: هێزێکی موسڵمانان ڕوودەکاتە ئەفریقیاو موسڵمانەکان بۆیان دەکەونە پەژارەوە، بەڵام خوای گەورە سەرکەوتوویان ئەکات و زۆرێك دەسکەوتیان ئەبێ و مەروان بەشەکان ئەکڕێ و هەندێ پارەی لەسەر دەمێنێتەوە، بۆ ئەوەی موسڵمانان ئاگاداری وەزعیان بن و بزانن ماون و سەرکەوتوون، چونکە موسڵمانان لەمەدینەدا بۆیان پەرێشان هاتبوون بەتایبەت ماوەکەیان دوورو ئاگاداریان نەبوون، سوپاکە مەروانی بەموژدەی سەرکەوتنەوە ناردەوە بۆ مەدینە، ئەم موژدەیە موسڵمانانی حەساندەوەو خۆشییەکی زۆریان بۆ دروست بوو، عوسمانیش وەك خەلیفەی موسڵمانان لەبری بەخششی مزگێنییەکە لەو پارەیە خۆش بوو کە لەسەر مەروان پێویست بوو بیدات، ئەمە پوختەی

بابەتەکەیە، بەلآم مێژوونووس و گێڕەرەوە شیعەکان ئەمەیان بەلایەکی تردا بووە بۆ ناشیرینکردنی خەلیفەی مۆژدەی بەهەشت پێدراو.

ئینجا لەکۆتاییدا خودی فەرموودەیەکی بوخاریی هێناوەتەوە کە پێشەوا عەلی فەرموویەتی و دەڵێ: لەهەگبەی شمشێرەکەیدا نووسراوێکی دەرهێناوە وتوویەتی: ئەم قورئانەو ئەم نووسراوەمان هەیەو باسی پیرۆزیی مەدینەی کردووە کە هەرکەسێك گێچەڵی تێدا بگێڕێ نەفرەتی خواو فریشتەو تەواوی خەڵکیی لەسەربێ و تا کۆتایی فەرموودەکە.

**پڕوپاگەندەی ئەوە ئەکات کە فەرموودەکانی تری بوخاریی فەرموودە نین، چونکە عەلی تەنیا ئەو نووسراوانەی ناوبردووە!**

وەلآم: پێشەوا عەلی مەبەستی ئەوە نەبووەو بوخاری و زانایانی تریش لەزەکەریا ئۆزێن باشتر لەباسەکە دەزانن، ئەوەی پێشەوا عەلی وتبێتی ئەم نووسراوەمان لایە مەسەلەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە، چونکە لەسەردەمی ئەو و پێشتر ڕۆژانی کۆتایی خەلیفە عوسماندا سەبەئییەکانی میسر کێشەیان لەمەدینەدا نایەوە، پێشەوا عەلیش لەبابەت مەدینەوە فەرموویەتی ئەمەمان لاهەیەو گەورەیی و پیرۆزیی مەدینەی بۆ گێڕاونەتەوە کە نابێ ڕێزی ئەو شارە بشکێنن، لەبەر هەمان مەبەستیش بوو مەدینەی پایتەختی خیلافەتی بەجێهێشت تا گێچەڵی لێ دووربخاتەوەو دوای

ئارامبوونەوەی دۆخەکە بۆی بگەڕێتەوە، ئینجا باسی ئەوە ئەکات کە نابێ بەبێ پرسی گەورەو سەردارەکەی نابێ دۆستایەتی و لایەنگیریی لاکەی تر بکات لەوەی سەبەئی و خەواریج و ئەوانەی لەفرمانی دەرچوون، ئەمەش بۆ توونـدوتۆڵکردنی سوپاکەی بووە بەپاڵپشتیی دەقی فەرموودەو لەبابەت مەدینەو سەرکردایەتییەوە ئەو نووسراوەی لا بووە، ئەگەر نا چۆن پێشەوا عەلیی پێشتر دادوەریی و دواتریش خەلیفایەتیی کردووەو فەرموودەی پەیامبەری خوای(صلی الله علیه وسلم)گێڕاوەتەوە؟

زەکەریا ئۆزۆن تەنیا قسەی جوێنراوی بەدگومانانی ترو ئەوانی پێش خۆی دوبارە ئەکاتەوە، وەك ئەوەی لەئێستادا ئەگەرچی دەستخۆشیی لێ ئەکەن، رەخنەی ئەوەشی لێ ئەگرن کە شانازیی ئەکات یەکەم کەس بووبێ ڕەخنەی لەبوخاریی گرتبێ، بەڵکو پێش ئەوە ئەحمەد سوبحی مەنسور یەکەم کەس بووە ئەوەی کردبێ و شەڕی شانازییانە! شانازیی و یەکەمین لەکاری قێزەون و گومانی پووچ، جا ڕەنگە لای هاوئارەزووەکانیان شانازییان پێ بکرێ، بەڵام لای موسڵمانان و کەسانی ڕاستگۆ شەرمەزارن و ماڵ وێرانی دونیاو قیامەتن، نمونەی کابرای لای مەلای مەشهورەن، بیری جوان و کاری جوانیان پێ نییە، ناچار لەڕێگەی پیسایی کردنە ڕێگەو دانیشتنی خەڵکیی ناوێك دەردەکەن! ئەگەر هەر دڵیان پێیخۆشە با پیرۆزیان بێ ئەو بەدناویە!

عَـنْ عَبْـدِ اللّٰـهِ بْـنِ عَمْـرٍو ، قَـالَ : كُنْـتُ أَكْتُـبُ كُلَّ شَيْءٍ أَسْـمَعُهُ مِنْ رَسُـولِ اللّٰـهِ صَلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أُرِيـدُ حِفْظَـهُ ، فَنَهَتْنِـي قُرَيْـشٌ ، وَقَالُـوا : تَكْتُـبُ كُلَّ شَيْءٍ سَـمِعْتَهُ مِـنْ رَسُـولِ اللّٰـهِ صَـلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ ، وَرَسُـولُ اللّٰـهِ صَلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ بَـشَرٌ يَتَكَلَّـمُ فِي الْغَضَـبِ وَالرِّضَـاءِ ؟ فَأَمْسَـكْتُ عَـنْ الْكِتَـابِ ، فَذَكَـرْتُ ذَلِـكَ لِرَسُـولِ اللّٰـهِ صَـلَّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ ، فَأَوْمَأَ بِإِصْبَعِـهِ إِلَى فِيـهِ ، وَقَـالَ : " اكْتُـبْ ، فَوَالَّـذِي نَفْـسِي بِيَـدِهِ مَـا خَرَجَ مِنْهُ إِلَّا حَق .

واتـــە: عەبــدوڵڵای کوڕی عەمــڕی کوڕی عاس دەیگێڕێتەوە و دەڵێ: هەر شتێکم لەپـەیامبەری خـواوە گوێ لێــبوایە دەمنووسیەوە، قورەیش ڕێگریان کرد و گــوتیان تــۆ هەموو قــسەیەکی پەیامبەری خوا دەنووسیتەوە، لە کـاتێکدا پەیامبەر مرۆڤە و لــە تــووڕەیی و ئاساییدا قسە دەکات؟ منــیش لە نووسینەوەی فــەرمووده دەستم هەڵــگرت و ئەوەم بۆ پەیامبەری خوا باسکرد، ئەویش بە پەنجەی ئاماژەی بۆ زمانی خـــۆی کرد و فەرمـووی: بنووسە، ســوێنــد بــەو کــەسەی گیـانی منــی بــەدەســتە، هیچ شتێك لەم زمانەوە دەرناچێ حەق و ڕاستی نەبێ.





COVER DESIGN
MUSTAFA IHSAN




5000 DI